

# ژیانی
# هەڵکەوتەکانی ئیسلام

## بۆ نەوجەوانان

نیهاد جەلال حەبیبوڵڵا





# ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ نەوجەوانان

نووسینی: نیهاد جلال حبیب الله



چاپی دووەم ٢٠٢٢ز- ١٤٤٣ك



**نوسینگەی تەفسیر**
**بۆچاپ و بڵاوکردنەوە**
**هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی**
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
حبیب الله ، نیهاد جلال
ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ نەوجەوانان، نیهاد جلال حبیب الله (نووسەر).
٢١٤ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، مێژوویی، ئاینیی
ISBN: 978-9922-654-71-3

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٤٨) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین: نوسینگەی تەفسیر

## پێشکەشە:

- بەوەی لە دڵەوە بە کوڵ نزایەک دەکات بۆ باوکی کۆچکردووم و دایکی ئازیزم.
- بە هەموو منداڵێکی سەر ئەم زەویە.
- بە هەموو مامۆستایەک، کە سەرقاڵە بە پەروەردە و پێگەیاندنی منداڵان.
- بە شێرزادی برای بچوک و ئازیزم و سایەی کچی نازدارم.
- بە هەر کەسێک لە ژیاندا ڕەزا مەندی خوای نیازە.
- بەوانەی شانازی دەکەن بە موسڵمان بوونیان و لەسەر ڕێبازی ڕاست هەنگاو دەنێن.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش تەنها و تەنها بۆ خوای گەورە، خوایە! سوپاس بۆ تۆ، تا ڕازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ، کە ڕازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ پاش رازی بوونت، هەموو سوپاس و ستایشێ بۆ تۆ خودایە، بەو جۆرەی شیاوی گەورەیی و تەنهایی خۆتە.

صەڵات و سەلامی خوا لە پێغەمبەری خوا، کۆتا نێردراو و سەرمۆری پێغەمبەران و دڵسۆز و خۆشەویستی یەکەمی هەر باوەڕدارێ، خوا لەسەر ئێمە و لەبری ئێمە پاداشتی بداتەوە، کە پەیامی خوای بە حەق و بە تەواوەتی گەیاند.

صەڵات و سەلامی خوا لە ئالوبەیتی پێغەمبەری خوا، کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا وەسفی کردون، صەڵات و سەلامی خوا لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا، کە خوا لەوان رازی بوو، ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون، چ ڕەزامەندیەک گەورەتر لە ڕەزامەندی خوا.

ئەم نووسینەی بەردەستتان، هەوڵێکی سەرەتاییە، هەتا بتوانین لە ژیانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، تا ئەمڕۆ بڕێ نموونەی کەسە گەورە و خواناسەکان بخەینە بەردەستی منداڵە ئازیزەکانمان، تا بتوانن پێشەنگییان پێوە بکەن و درێژە بەو ڕێبازە بدەن.

بەرگی یەکەمی تایبەت کراوە بە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)، کە چەند جارێ چاپ کراوە، بەرگی دووەمیشی تایبەت بوو بە خەلیفەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، بەرگی سێهەمیشی تایبەت بوو بە هاوەڵان، کە ژیانی پانزە هاوەڵی لە خۆدەگرت، بەرگی چوارەمیشی تایبەت بوو بە هەڵکەوتەکانی ئیسلام و تیایدا ژیانی پانزە هەڵکەوتەی ناو مێژووی ئیسلامی باسکرابوو، هەریەک لەوانەش دووجار چاپ کران، بەڵام بە پێویستمان زانی ئەم بەرهەمە دەوڵەمەندتر بکەین، بۆیە بەم چەشنە گۆڕانکاریمان تێدا کرد:

بەرگی یەکەممان" تایبەت بە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) هێشتەوە.

بەرگی دووەممان" لەگەڵ ژیانی هاوەڵانی تر یەکخست و تیایدا" جگە لە پێنج خەلیفەکە، ژیانی پانزە هاوەڵیشمان داناوە.

بەرگی سێهەم درێژەپێدەری ژیانی هاوەڵانە و" تیایدا ژیانی چل و پێنج هاوەڵی تری تێدایە، واتە: بە خەلیفەکانیشەوە ژیانی شەست و پێنج هاوەڵ باسکراوە.

بەرگی چوارەممان تایبەت کرد بە هەڵکەوتەکانی ئیسلام و لە بری یانزە کەسایەتیی، ژیانی (سی) هەڵکەوتەی ناو مێژووی ئیسلامیمان باسکردووە.

سوپاس بۆ خوای گەورە، ئێستاش ژمارەی کۆتایی زنجیرەکەمان تەواو کرد بە ناونیشانی: (ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ منداڵان)، تا هەم منداڵانمان لەسەرژیانی پڕ خێری ئەو زانا و سەرکردانە پەروەردە بکەین، هەم پێیان بڵێین: نموونەی باڵای ئیسلامەتی لە قۆناغی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانیدا قەتیس نەماوە، بەڵکو وا مشتێ نموونە بۆ خەرواری چواردە سەدەی مێژووی ئیسلام، کە هەزاران زانا و سەرکردە لەسەر ئەو مەنهەجەی هاوەڵان بوون و، توانیویانە وەک چراش ئەو ڕووناکییە بە دەوری خۆیاندا بڵاو بکەنەوە.

لەم نووسینەدا هەوڵمان داوە، ژیانی (سی) زانا و سەرکردە بهێنین لەسەر بنەمای جیاوازی ڕەگەزیی و ناوچەییان، بەڵام یەکدەنگی هەموویان لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننەتن، تا نەوەکانمان بزانن هەموو ئوممەتانی موسڵمان زانایانی ڕێ ڕاستیان تێدا بووە، کە خزمەتی گەورەیان پێشکەشکردووە.

بۆ نموونە: باسی (إبن مندە)مان هێناوە، کە فارسە، (عمر بن عبدالعزیز)مان هێناوە، کە عەرەبە، (ابن تیمیة) و (صلاح

الدین)مـان هێنـاون، کە کـوردن، (محمـد الفاتح)مـان هێنـاوە، کە تــورکە، (یوســف)ی کــوڕی (تاشــفین)مــان هێنــاوە، کە بەربەریە(صــنهاجی)، ئەمەش وێــنەی جــوانی ئەو بــڕایەتییە ئیمانییەیە، کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکردووە.

لە خـوای گەورە داواکـارین، بەهەشـتی بەریـن بکـاتە شـوێنی ئەو زانـا و سـەکردانە و، نمـوونە و هاوشـێوەکانیان لە تاوانیـان خۆش بێت.

ئەم کارەش پـاک و پوخت لە بەر خۆی بێت و، بە دووری بگرێت لە هەر نیازێکی تـر، ئەم بەرهەمە و بەرهەمەکـانی تـری زنجیرەکەش، بکاتە خێر و ڕوونـاکییەک بـۆ منـداڵانی موسڵمان و کاریگەریی بۆ نەوەی نوێ.

(إن أرید إلا الاصلاح ما استطعت و مـا تـوفیقي إلا باللـه علیـه توکلت و إلیه أنیب).

نهاد جلال حبیب الله

سلێمانی

# أبو حنيفه

یەکێکی تر لە زانا و پێشەوا هەرە گەورەکانی ناو مێژووی ئیسلامی ئیمامی (أبو حنيفە)یە، ئەم پێشەوا خواناسە ڕێبەری یەکێکە لە چوار مەزهەبە گەورەکە.

(أبو حنيفە) ناوی (نعمان ابن ثابت)ە، بەڕەچەڵەک فارسە، واتە فارسەکان سەدان و هەزاران زانای گەورەی ئەهلی سوننەیان هەبووە وەک چۆن لەم کتێبەدا باسی چەند دانە لەو زانایانەمان کردووە، ئەوەش فەزڵێکی خوایە کە لە هەموو نەتەوەکاندا زانا و سەرکردەی موسوڵمان هەبوون تا فەزڵ و گەورەیی ئیسلام بەر هەموو نەتەوەکان بکەوێت.

ماڵی باوباپیرانی (أبو حنيفە) لە (افغانستان) بوون لە (کابول)ی ئێستا، بەڵام باپیرەی لە سەردەمی ئیمامی (عمر)دا

موسوڵمان بوو، هات لە (کوفة) نیشتەجێ بوو.

(أبو حنیفه) لە ساڵی هەشتای کۆچیی لە (کوفة) لە دایکبووه، بنەماڵەکەی خواناس و ڕوو لە دین بوون، هەروەها باوکێکی دەوڵەمەند و زۆر بەخشندەی هەبوو، (أبو حنیفة)ش تاقانەی باوکی بوو، ئیتر باوکی هێندەی تر گرنگی پێدەدا و نازی دەکێشا، باوکی لە (کوفه)دا دووکانی جلوبەرگی هەبوو، دواتریش ئەو دووکانە مایەوە بۆ (أبو حنیفة).

(أبو حنیفه) هەر لە منداڵییەوە دەستیکرد بە لە بەرکردنی قورئانی پیرۆز، ڕۆژانەش لەگەڵ باوکیدا دەچوو بۆ دووکان تا هاوکاری باوکی بکات، چونکە ئەو لە نارەحەتی و ماندووبوونی باوکی تێدەگەیشت، باوکیشی حەزی دەکرد (أبو حنیفة)ی کوڕی فێری ئیش بێت تا لە داهاتوودا بتوانێت خۆی بژێوی خۆی دابین بکات.

ڕۆژێک (أبو حنیفه) بەلای یەکێک لە زاناکاندا ڕۆشت کە ناوی (شعبی) بوو، ئیمامی (شعبی) (أبو حنیفة)ی بانگ کرد و پێی وت: بۆ کوێ دەچیت؟

وتی: دەچم بۆ دوکانی فڵانەکەس.

(شعبی): وتی مەبەستم دوکان نییە، بۆلای چ زانایەک دەچیت؟

ئەویش وتی: من زۆر کەم دەچم بۆ لای زانایان.

(شعبی) وتی: وامەکە، خوو بدەرە زانست و بڕۆ بۆ خزمەت زانایان و لە کۆڕی ئەواندا دابنیشە، زیرەکییەکت تێدا بەدی دەکەم پێم خۆشە سوودی لێوەربگریت.

ئیتر(أبو حنیفە)شەیداییەکی بۆ زانست پەیدا کرد و ئەو قسەیە بوو بە مایەیی خێر بۆی.

لە تەمەنی شانزە ساڵیدا (أبو حنیفە)لەگەڵ باوکی چوو بۆ حەج، لەوێ زانایەکی بینی خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆببوونەوە.

(أبو حنیفە) وتی: باوکە گیان ئەو زانایە کێیە؟

لەوەڵامدا باوکی وتی: ئەوە پیاوێکە هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە، پێی دەڵێن (عبدالله ابن حارث).

ئەویش وتی: ئەی چی زانستێکی پێیە؟

باوکی وتی: ڕۆڵە گیان ئەوە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) پێیە.

وتی: باوکە گیان بمبە بۆ لای، ئەویش پێشی کەوت و بردی بۆلای ئەو هاوەڵە بەڕێزە، لەوێ ئەو هاوەڵە فەرموودەیەکی گێڕایەوە و وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەس شارەزا بێت لە دینی خوادا ئەوە خوا ئەرک و خەمەکانی بۆ چارەسەر دەکات و لە لایەکەوە ڕۆزی دەدات کە چاوەڕوانی ناکات).

ئەو فەرموودەیە زۆر کاری کردە سەر (أبو حنیفە)و ئیتر

خووی دایە وەرگرتنی زانست، تەمەنی نەگەیشتبووە بیست ساڵ، کە هێندە زانستی وەرگرتبوو لە ناو خەڵکی ناوبانگی زۆری پەیدا کرد و لە مزگەوتی (کوفة)دا وانەی دەوتەوە.

ڕۆژێک (أبو حنیفه)دەچوو بۆ لای مامۆستاکەی کە ناوی (اعمش) بوو، کابرایەک هات بۆ لای (اعمش) تا سەبارەت بە مەسەلەیەک پرسیاری لێبکات

ئەویش بە (أبو حنیفة)ی وت: تۆ وەڵامی بدەرەوە، (أبو حنیفة)ش وەڵامێکی بەهێزی دایەوە.

(اعمش) مامۆستای تەواو سەرسام بوو، پێی وت: ئەو وەڵامەت لە کوێ بوو؟

ئەویش وتی: مامۆستا گیان لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە ە جەنابتم بیست بۆت گێڕامەوە.

(أبو حنیفه)مامۆستایەکی تری هەبوو بەناوی (حماد) هێندە ڕێزی ئەو مامۆستایەی دەگرت کە خەڵکی بەسەرسامییەوە باسیان دەکرد، جاری وا هەبوو دەچووە بەردەرگای ماڵی مامۆستاکەی، ڕووی نەبوو لە تەقەی دەرگا بدات، دەوەستا تا مامۆستا بە ئیسراحەتی خۆی بێتە دەرەوە، ئینجا زانستی لێوەردەگرت، هەروەها تا لەگەڵ مامۆستاکەیدا بوایە خزمەتی دەکرد و هەر کارێکی بوایە بۆی جێبەجێ دەکرد، تەنانەت هێندە ڕێزی مامۆستاکەی دەگرت لە ماڵی خۆیشیاندا ڕووە و

مـاڵی مامۆسـتاکەی قـاچی ڕاندەدەکێشـا، هەرکـاتیش نـوێژی بکردایە نزای دەکرد بۆ دایکی و باوکی مامۆستا (حماد).

مـاوەی هەژدە سـاڵ ئـاوا لە خـزمەت مامۆسـتاکەیدا بـوو تـا دواجـار مامۆسـتاکەی وەفـاتی کـرد، ئیتـر (أبـو حنیفە)چـووە شـــــوێنی مامۆســــــتاکەی و ئەمجـــــار ئەم وانەی دەوتەوە بە خوێندکارەکان.

ئیمـــــــامی (أبــــو حنـــــیفە)جگە لەوەی وانەی دەوتەوە بە خوێندکارەکان، هاوکـات چاوی لە بـاری ژیـانی خوێنـدکارەکانی بــوو، هەر خوێنــدکارێکی هەژار بــوایە، خێـرا یــارمەتی دەدا و پێویسـتیەکانی بـۆ دابین دەکـرد تـا ناچـار نەبێت واز لە زانست وەرگـــرتن بهێنێـــت، خـــوای گەورەش بەردەوام (أبـــو حنیفـــة)ی دەوڵەمەندتر دەکرد چونکە بەخشندەیی زۆر زۆر بوو.

(أبـو حنـیفە)لەگەڵ دایکیشـیدا زۆر چـاک بـوو، تەنـانەت هەندێک جار بۆ پرسیارێکی دایکـی دەچوو بـۆ لای کـۆمەڵە زانـــایەک کە زۆر لێـــی دوور بـــوون، هەرچەنـــدە خـــۆی وەڵامەکەشـی دەزانـی، بەڵام حەزی دەکـرد لەبەر دڵـی دایکـی بچێت بۆ لای ئەو زانایانە، ئەوەش جێبەجێکردنی فەرمانی خوا بوو کە فەرمانی کردووە تا دەتوانین لەگەڵ دایـک و باوکمانـدا چاکەکار بین.

لە سـاڵی ١٢٧ ی کۆچیـدا (خەواریجەکـان) کە تـاقمێکی

گـــومڕا بـــوون دەســـتیان گـــرت بەســـەر شـــاری (کوفـــة)دا، سـەرکردەکەیان داوای لە (أبـو حنیفه)کـرد، بچێـتە نـاو ڕیـزی ئەوانەوە، ئەویـــش ڕازی نەبـــوو، ئیتـــر بەدەســـت خەواریجەکـــانەوە نـاڕەحەتی زۆری هـاتەڕێ، دواتـریش کە (ئومەویەکـان) هـاتنەوە سەر دەسەڵات، (أبو حنیفه)بەدەست سەرکردەیەکیانەوە نـاڕەحەتی چەشـت و کـرایە بەنـدیخانەوە و ڕۆژانە دە قـامچی لێـدەدرا، جـا قامچیەکیـــان بەر دەموچـــاوی کەوت و دەموچـــاوی برینـــداربوو، دەستی کرد بەگریان.

وتیان: بۆچی گریایت؟

وتـی: لە بەر ئـازاری قـامچیەکە نـا، بەڵکـو لەبەر ئەوەی ئەگەر دایکم ئەو برینەی دەموچاوم ببینێت خەفەت دەخوات، منـیش بـۆ ئەو خەفەتەی دایکم ئەگریم.

دواجار خەلیفەی ئەوکـاتی موسـوڵمانان کە نـاوی (أبـو جعفـر) بـوو داوای لە (أبـو حنیفه)کـرد تـا ببێـتە دادوەر، بەڵام ئەو ڕازی نەبـوو، (أبـو جعفـر) زۆری لێکـرد و ئیمـامیش هەر ڕازی نەبـوو، بۆیە لەسەر ئەوە (أبـو حنیفـة)ی کـردە بەنـدیخانەوە، دواتـر داوای لێکـرد هاوکـاری دادوەرەکـان بکـات تـا نەکەونە هەڵەوە، کەچـی هەر ڕازی نەبوو، چونکە حەزی نەدەکرد نزیکی دەسەڵاتدارەکان بێت.

دواجـــار (أبـــو حنـــیفه) لە مـــردن نزیـــک بـــووەوە و لە کـــاتی وەفاتیدا سەری لە سوجدەدا بـوو، ئەوەش فەزڵێکـی خـوا بـوو کە

بەو زانـــایەی بەخشـــی، زانایـــان و موســـوڵمانان و تەنـــانەت دەسـەڵاتدارەکانیش زۆر خەفەتیـان خـوارد بەمەرگـی ئەو زانـایە و مەرگی ئەویان بە هۆکارێکی کەمبوونەوەی زانستیان دەزانی و نزای خێریان بۆ دەکرد.

**پرسیار:**

١- (أبو حنیفە)بەرەچەڵەک سەر بە چ نەتەوەیەک بوو؟
٢- باوکی (أبو حنیفە)سەرقاڵی چی بوو؟
٣- یەکەم فەرمووده (أبو حنیفە)لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بیست کامە بوو؟
٤- پەیوەندی نێوان (أبو حنیفە)و (حمادی) مامۆستای چۆن بوو؟
٥- بۆچی (أبو حنیفە)کرایە بەندیخانە؟
٦- (أبو جعفر) چۆن ڕێزی دایک و باوکی خۆی دەگرت؟

# امام مالك

لە ناو شارە شیرینەکەی پێغەمبەری خوادا(صلی اللە علیە وسلم)، زانایانێکی زۆر دەرکەوتن، چونکە ئەو شارە، شاری هاوەڵانی ئازیز بوو، هەم پشتیوانان و هەم کۆچەرانیش لەوێ بوون، زانایانێک دەرکەوتن، کە لە خزمەت هاوەڵان، یان خوێندکارانی هاوەڵاندا زانستیان وەرگرتبوو.

بۆیە زانستەکەیان زۆر ڕاست و بێگومان بوو، یەکێک لەو زانا گەورە و بەڕێزانە ئیمامی (مالک)بوو (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، ئەو ئیمامەی، کە ماوەیەکی کەم دوای ژیانی پێغەمبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) دەرکەوت، تەنیا نزیکەی هەشتا ساڵ بەسەر کۆچی دوایی پێغەمبەری خوادا(صلی اللە علیە وسلم)تێپەڕ ببوو، کە ئەم زانا گەورەیە لە دایکبوو.

ئیمامی (مالک) ناوی باوکی (انس) بوو، دایکیشی ناوی (عالیة) بووە، دایک و باوکی، کەسانی زۆر باوەڕدار و چاک بوون.

خوای گەورە، (مالک)ی بەو دوو هاوسەرە بەخشی، کە

دواتر بوو بەزانایەکی زۆر گەورە و ناسراوی جیهانی ئیسلامیی، کە تــا ئەمــڕۆش بەشــێکی زۆری موســوڵمانان لەســەر مەزهەبەکەی ئەون.

لە ساڵی (٩٣)کۆچیدا، ئیمامی (مالک) لە (مدینه) لە دایکبوو، واتە لەو شارەی، کە تیایدا بۆ یەکەمجار، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراند و تیایدا مایەوە، تا لەوێ کۆچی دوایی کرد، ئیتر ئەو شارە ناسراوە بەشارەکەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم).

هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە، ئیمامی (مالک) دەستیکرد بە وەرگرتنی زانست و دەچووە خزمەت مامۆستایان و شارەزایان و، زانستی شــەرعی وەردەگــرت و لە پێنــاو بەدەســتهێنانی زانســتدا، نەیدەزانی ماندوو بوون چییە!

ئیتــر قورئــانی پیــرۆزی لەبەرکــرد و فەرمــوودەیەکی زۆری پێغەمبەری خوای(صلی الله علیه وسلم) لەبەرکرد، وەک چۆن دەبینــین، دواتــر کتێبــی تــایبەت بەفەرمــوودەی نووســی، بە ناوی:(الْمُوَطَّأُ)، کە هەرچی زانای دواتر هەبوون ئەو کتێبەیان لەبەر دەکرد.

بنەمــاڵەکەی ئیمــام (مالــک)، هەموویــان ســەرقاڵ بــوون بە زانســتی فەرمــوودە و لەبەرکردنــی فەرمودەکــانی پێغەمــبەری خوداوە(صلی الله علیه وسلم).

بۆ نموونە: مامی، کە ناسرابوو بە(ابو سهیل)، زانایەکی دیاری بواری فەرموودە بوو، هەروەها (النظر)ی برای، سەرقاڵی زانست بوو، هەردەم لەگەڵ زانایاندا بوو، دایکی (مالک)یش، زۆر هاندەری (مالک) بوو، بۆ ئەوەی بگات بەو ئاستە بەرزە.

ئیمامی (مالک) لە شێوەدا، کەسێکی زۆر قۆز و کەشخە بووە، هێندە جوان بووە، کە جوانییەکەی لای خەڵک ناسراو بووە، ڕوخسارێکی سپی و باڵایەکی پڕ و بەرز و موویەکی جوان، ئیتر جوانی ئیمامی (مالک) لە ناو خەڵکدا، شایەنی باسکردن بووە.

پاش ئەوەی تەمەنی (مالک) کەمێک گەورە بوو، خێرا پووری هات بۆ لای و وتی: ئیتر کاتی ئەوە نییە دابنیشیت، بەڵکو بڕۆ فەرموودە بنووسەرەوە، چونکە کاتی ئەوە بوو، بەتەواوەتی تاو بداتە وەرگرتنی زانست، نەک دابنیشێت و بە تەمبەڵیی ژیان بباتە سەر.

یەکێک لە مامۆستاکانی ئیمامی (مالک)، ناوی: (إبن هرمز) بوو، جاری وا هەبوو، کە ئیمامی (مالک) دەچوو بۆ ماڵی مامۆستاکەی، تا زانستی لێوەربگرێت، هەر لە بەیانییەوە دەچوو بۆ ماڵیان و، لە لای ئەو زانستی وەردەگرت، تا ئەو کاتەی دەبوو بە شەو و دونیا تەواو تاریک دەبوو، ئینجا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

مامۆستایەکی تری ئیمامی (مالک)، ئیمام (جعفر الصادق) بوو، کە لە بنەماڵەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، ئیمام (مالک) چەند فەرموودەیەکی لەم مامۆستایەوە گێڕاوەتەوە.

هەروەها دەیان مامۆستای تری هەبوو، کە فەرموودەی لەوان وەردەگرت و لە کتێبەکەیدا تۆماری کردوون، دەتوانیت داوا بکەیت لە کەسێکی شارەزا وەک: باوکت، یان مامۆستایەکت، تا کتێبەکەی ئیمامی (مالک)ت پیشان بدەن، کە ئەو فەرموودانەی تیادا نووسیوەتەوە، کە لە مامۆستاکانییەوە بیستوویەتی و تۆماری کردوون.

ئیتر لە ماوەیەکی کەمدا ئیمامی (مالک)، بوو بەزانایەکی گەورە و دادەنیشت، تا فەتوا بۆ خەڵک بدات، هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە (بیست و یەک)ساڵ، کە فەتوای بۆ خەڵکی دەدا و کێشەی خەڵکی چارەسەر دەکرد و وەڵامی پرسیاری خەڵکی دەدایەوە.

هاوکات زۆربەی ئەو پرسیارانەی لێی دەکرا، خێرا وەڵامی نەدەدایەوە، بەڵکو دەوەستا، تا پرسی بەدەیان زانای گەورەی ناو (مدينة) دەکرد، لە ترسی ئەوەی، نەک لە خۆیەوە وەڵامێک بداتەوە و وەڵامەکەی ڕاست نەبێت، ئیتر جاری وا هەبوو بۆ

وەڵامی پرسیار و فەتوایەک، ڕای (حەفتا) زانای گەورەی وەردەگرت، لە کاتێکدا ئەوکاتە تەمەنی ئیمامی (مالک) چل ساڵ بوو.

واتە: ئەو کات زانستێکی زۆری پێبوو، نەک لەبەر ئەوەی نەیزانێت، بەڵکو بۆ ئەوەی بەڕای زانایان، وەڵامی دروستتر بە موسوڵمانان ببەخشێت.

کەواتە: دەبێت ئێمەش فێر بین، هەرچی پرسیارێک کرا، یەکسەر وەڵام نەدەینەوە، بەڵکو تۆزێک بیری لێبکەینەوە و بە وریاییەوە وەڵام بدەینەوە، تا قسەیەک نەکەین، کە زیانی بۆ کەسانی تر تێدابێت.

ئیمامی (مالک) بۆ هەموو وانەوتنەوە، یان نووسینەوەیەکی فەرموودەیەک، یان خوێندنەوەی کتێبێک، دەستنوێژی دەگرت و بەبێ دەستنوێژ، نەدەچووە بواری زانستەوە، تەنانەت کاتێک دادەنیشت، تا وەڵامی پرسیاری خەڵک بداتەوە، دەست نوێژی دەگرت، ئەوەش لە بەر ڕێزی ئەو پێشەوایە بوو بۆ زانست، هەروەها جێگیر بوونی لە خواترسان بوو لە دڵ و دەروونیدا.

ئەم ئیمامە بەڕێزە، زۆر هەوڵی دەدا خۆی بپارێزێت لە نیازی خراپ و ڕیا و ڕوپامایی، بەڵکو لە کارەکانیدا هەوڵی دەدا، زۆر نیاز پاکیی بەکاربهێنێت، چونکە دەیزانی هەر کارێک،

پاک و پوخت لەبەر خوای گەورە نەبێت، ئەوا خوای گەورە لێی وەرناگرێت.

ئیمامی (مالک) قوتابی و خوێندکارێکی زۆری هەبوو، کە ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی ١٤٠٠ خوێندکار، یەکێک لەو خوێندکارانەی، ناوی ئیمامی (شافعی) بوو، کە لە خزمەتیدا فەرموودەی وەردەگرت و، هەموو کتێبەکەی ئیمامی(مالک)ی لە بەرکرد بوو، ئیمامی (مالک)یش، ئامۆژگاری ئیمامی(شافعی) کرد، کە خۆی لە گوناهـ و تاوان بپارێزێت، چونکە گوناهـ و تاوان، ڕووناکی دڵ ناهێڵێت و دەیکات بە تاریکی.

دواجار وادەی ژیانی ئیمامی (مالک) تەواو بوو، ئەوەبوو لە مانگی (ربيع الأول)ی ساڵی ١٧٩ کۆچیدا، لە تەمەنی هەشتا و شەش ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و سەرکردەی موسوڵمانان لە (مدينة)، نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد، بەشێکی زۆری خەڵکی ناو (مدينة) لە مەراسیمی بەخاک سپاردنیدا بەشدار بوون.

**پەند و وانە**

منداڵە ئازیزەکان!

زۆر پێویستە ئێمەش وەک ئیمامی (مالک) و ئیمامەکانی تر، هەوڵ بدەین فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبەربکەین، چونکە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەرچی فەرموودەیەکی فەرمووە، خوای گەورە خستوویەتیە دڵییەوە و قسەکەی ڕاست و دڵنیایە، هەر بۆیە هەرچی فەرموودەیەک هەیە بە دڵنیاییەوە ڕاستە و خوای گەورە پێی ڕازیە.

پێویستە لە خۆمانەوە وەڵامی هەموو پرسیارێک نەدەینەوە، بەڵکو زۆر هەڵەیە لە خۆمانەوە وەڵام بدەینەوە، چونکە خەڵک تووشی هەڵە دەکەین، بەڵکو دەبێت پرسیار بکەین، لە زانایانی شارەزا، تا وەڵامی ڕاست وەربگرین، ئینجا وەڵامی کەسانی تر بدەینەوە، دەبینین ئیمامی (مالک) بەو هەموو زانستەوە راوێژی کردووە بە زانایانی تر، ئینجا فەتوای داوە، بۆیە ئەوە ئیشی هەموو کەسێک نییە فەتوا بدات و وەڵامی هەموو پرسیارێک بداتەوە.

دەبێت هەر كارێكمان كرد پاك و پوخت بێت و تەنیا لەبەر خودای گەورە بێت، چونكە هەر كارێك نیازی تری تێكەڵ بێت خودای گەورە وەری ناگرێت، هەر بۆیە ئیمامی (مالک) هەوڵیدەدا نیازی زۆر پاک بێت بۆ خودای گەورە.

**پرسیارەكان**

| |
|---|
| ٧- بنەماڵەی ئیمامی (مالک) بە چی ناسرابوون؟ |
| ٨- ئیمامی (مالک) لە كوێ لە دایكبووە و لە كوێ كۆچی دوایی كرد؟ |
| ٩- ژیانی منداڵی ئیمامی (مالک) باس بكە. |
| ١٠- ئیمامی (مالک) چی ئامۆژگاریەكی پێشكەش كرد بە ئیمامی (شافعی)؟ |
| ١١- ناوی كتێبەكەی ئیمامی (مالک) چیە؟ تیایدا چی نووسراوە؟ |
| ١٢- كاتێک پرسیار دەكرا لە ئیمامی (مالک) چۆن وەڵامی دەدایەوە؟ |
| ١٣- دەتوانیت ژیانی ئەم زانایە باس بكەیت بۆ هاوڕێیەكت؟ |
| ١٤- ناوی خوێندكارێكی ئیمامی (مالک) بنووسە. |
| ١٥- بەچی شتێكی ژیانی ئیمامی (مالک) سەرسام بوویت؟ |

## امام الشافعي

لەسەر زەمینی پان و بەریندا خاکێک هەبوو، کە لانەی پێغەمبەران بوو، گۆڕی زۆربەی پێغەمبەران لەوێ بوو، یەکێک لە خۆشەویستترین مزگەوتەکانی موسوڵمانانی تێدابوو، کە ئەویش مزگەوتی (اقصی) بوو، بەڵێ ئەو خاکە (فلسطین)ە.

لەم خاکە خۆشەویستەدا، کە (قودس)ی تێدایە و ئێستا جوولەکەکان داگیریان کردووە، لە شارێکی جواندا زانایەکی گەورە لەدایکبوو، کە ئەویش ئیمامی (شافعی)یە.

ئیمامی (شافعی) ناوی (محمد)ە، باوکیشی ناوی (ئیدریس)ە، دایکیشی ناوی (فاطمە)یە، ئەم زانا خۆشەویستە عەرەبە وەک چۆن لە نەتەوەکانی تری موسوڵماندا زانا دەرکەوت وەک (ابن مندە)، کە فارس بوو، (ابن تیمیة)، کە کورد بوو، یەکێک لە زاناکانی عەرەبیش ئیمامی (شافعی) بوو، کاتێک دەڵێن مەزهەبی (شافعی) مەبەستیان بە

شوێنکەوتنی ڕاوبۆچوونەکانی ئەم زانایەیە، کە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە باسی کردوون.

ئیمامی (شافعی) لە ساڵی ١٥٠ کۆچی لە (غزة) لە دایکبووە، لە تەمەنی دوو ساڵیدا بوو، کە دایکی بردوویەتی بۆ (مكة)، ئیتر لەوێ گەورە بوو، پاشان لە تەمەنی حەوت ساڵییدا هەموو قورئانی پیرۆزی لە بەرکردووە، کە تەمەنی گەیشتووەتە دە ساڵ کتێبی (الموطأ)ی لە بەرکرد، کە ئیمامی (مالک) نووسیویەتی، ئیتر بەردەوام سەرقاڵ بوو بە وانە خوێندن و زانست وەرگرتن، تا هێندە زانستی پەیدا کرد، کە بگاتە ئەو ئاستەی پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە بیست ساڵ، مۆڵەتی پێبدرێت فەتوا بدات.

هەروەها ئیمامی (شافعی) چوو بۆ شاری (مدينة)، تا لەوێ لە لای ئیمامی (مالک) زانست وەربگرێت، پاش ئەوەش هەر لە پێناو وەرگرتنی زانستدا ڕووی کردووەتە (یمن)، لەوێ ئیش و کاریشی دەکرد، دوای ئەوەش لە تەمەنی ٣٤ ساڵیدا ئیمامی (شافعی) دێت بۆ، کە ئەو کات پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو و خەلیفەی موسوڵمانان لە (بغداد) بوو، دوای ئەوەش جارێکی تر گەڕایەوە بۆ (مكة)، نزیکەی نۆ ساڵ لەوێ مایەوە، لەو ماوەیەشدا خزمەتی گەورەی پێشکەش بەخەڵک دەکرد، لەناو

مزگەوتی کەعبەدا وانەی دەوتەوە بە موسوڵمانان، کێشەی خەڵکی چارەسەر دەکرد و سەرقاڵی کاروباری موسوڵمانان دەبوو.

جارێکی تر ئیمامی (شافعی) بریاریدا بچێت بۆ (بغداد)، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٥ کۆچییدا جارێکی تر چوو بۆ (بغداد)، پاش ئەوەی لەوێ ماوەیەک مایەوە و خزمەتی موسوڵمانانی کرد بەو زانستە زۆرەی هەیبوو، وانەی بەخوێندکاران دەوتەوە، یەکێک لە خوێندکارەکانی بریتی بوو لە ئیمامی (احمد بن حنبل)، هەروەها بۆ چارەسەری کێشەی موسوڵمانان دەچوو بۆ لای خەلیفە و کێشەکانی دەگەیاند، بەڵام خۆی هەرگیز ڕازی نەبوو پۆست و دەسەڵات وەربگرێت، ئینجا بڕیاری دا بچێت بۆ وڵاتی (مصر)، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩ کۆچیدا واتە دوای چوار ساڵ مانەوە لە (بغداد) چوو بۆ وڵاتی (مصر) و لەوێ دەستی کرد بەوانە وتنەوە و بڵاوکردنەوەی زانست لە ناو خەڵکیدا، هەر لەوێ مایەوە، تا ئەوەی لە دوای پێنج ساڵ مانەوە لە ساڵی ٢٠٤ کۆچی لە وڵاتی (مصر) وەفاتی کرد، هەر لەوێش تەرمەکەی بەخاک سپێردرا.

ئیمامی (شافعی) لە (مكة) زۆر بە هەژاری دەژیا، ژیانی پڕ لە نارەحەتی و برسێتی و نەبوونی بوو، بەڵام ئەوەی نەدەکرد بەگرفت بۆ ژیانی، بەڵکو بیری لای ئەوە بوو بەردەوام بەدوای

زانستدا بگەڕێت، ژیانی زۆربەی زانایانی ئیسلامیش وابووە، کە بەهەژاریی ژیانیان بەسەر بردووە و زۆر گرنگییان بەماڵ و سامانی دونیایی نەداوە، چونکە زانیویانە ژیانی دونیا کاتییە و باشتر وایە لە بری خۆشی دونیایی سەرقاڵبن بە زانستەوە.

ئیمامی (شافعی) دەچوویە خزمەت مامۆستایان و فەرموودەی وەردەگرت لێیان و لە بەری دەکرد، ئینجا ئەو فەرموودانەی دەنووسییەوە، ئەمەش نیشانەی ئەوپەڕی تامەزرۆیی ئیمامی (شافعی) بووە بۆ زانستی فەرموودە.

ئیمامی (شافعی) بۆ ئەوەی زمانی پاراوی عەرەبی وەربگرێت ماوەیەک (مكة)ی جێهێشتووە و چووە بۆ لادێیەکانی ئەو ناوچەیە، چونکە لەوێ بە جوانی زمانی عەرەبی وەردەگرت، لەوێ بەشێکی زۆر شیعری بڵاوی ناو هۆزەکانی لە بەر کرد.

کاتێک ئیمامی (شافعی) هەواڵی ئیمامی (مالک)ی بیست لە (مدینە) بڕیاری دا بچێت بۆ لای، تا لە خزمەتیدا زانست وەربگرێت، ئەو کات تەمەنی ١٤ ساڵ بوو، ئیتر بەڕێکەوت و لەو ماوەیەشدا قورئانی پیرۆزی دەخوێند، تا گەیشتووەتە (مدینة)شانزە جار هەموو قورئانی پیرۆزی دووبارە خوێندووەتەوە.

کاتێک ئیمامی (شافعی) گەیشتووەتە (مدینة)چووە بۆ

مزگەوتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و لەوێ نوێژی کردووە، ئینجا ئیمامی (مالک)ی بینیوە لای گۆڕی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم)، کە فەرموودەی دەگێڕایەوە، ئینجا چووە بۆ لای ئیمامی (مالک)، ئەویش پێی وتووە لە خوا بترسە و خۆت دوور بگرە لە تاوان چونکە تۆ کەسێکی گەورە دەردەچیت، خوا رووناکییەکی خستووەتە ناو دڵتەوە تۆیش وریابە بەتاوان ئەو رووناکییە نەکوژێنیتەوە، ئیتر ئیمامی (شافعی) لە خزمەت ئیمامی (مالک)دا دادەنیشت و وانە دەخوێنێت.

ئیمامی (شافعی) لە کاتی قورئان خوێندندا دەنگی زۆر خۆش بوو هەمووان، کە لە دەوری دەبوون سەرسام دەبوون بەو دەنگە خۆشەی، تەنانەت ئیمامی (مالک)، کە مامۆستای بوو سەرسام ببوو بەدەنگی خۆشی ئیمامی (شافعی) لە کاتی قورئان خوێندندا.

جارجارە ئیمامی (شافعی) دەگەڕایەوە بۆ لای دایکی بۆ (مکة) و سەردانی دەکرد و دواتر دەگەڕایەوە بۆ لای ئیمامی (مالک)، هەروەها جارجار دەچوو بۆ شوێنانی تر و دەگەڕایەوە بۆ لای مامۆستاکەی تا ئەوەی لە ساڵی ١٧٩ کۆچییدا مامۆستاکەی، کە ئیمامی (مالک) بوو، کۆچی دوایی کرد، دوای ماوەیەک دەسەڵاتداری موسوڵمانان لە (یمن) هات بۆ

(مكة)، ئەوەبوو ئیمامی (شافعی) بڕیاریدا لەگەڵیدا بچێت بۆ (یمن)، هەم بۆ ئەوەی ماوەیەک لەوێ ئیش بکات، هەم بۆ ئەوەی زانست وەربگرێت و زانستیش ببەخشێت، بۆیە چوو بۆ (یمن) و لەوێ ماوەیەک بوو بە بەرپرسی ناوچەی (نەجران).

بەڵام لەوێ دەسەڵاتدارێکی خراپ هەبوو کە بەردەوام پیلانی لە دژی ئیمامی (شافعی) دەگێڕا.

**پرسیار بۆچی ئەو دەسەڵاتدارە وای دەکرد؟**

وەڵام: چونکە ئەو دەسەڵاتدارە ستەمکار بوو، ستەمی لە خەڵک دەکرد، ئیمامی (شافعی)ش هەموو جار ئامۆژگاری دەکرد و ئاگەداری دەکردەوە لەوەی ستەم حەرامە و جاری وایش هەبوو لێی توڕە دەبوو، کاتێک دەیزانی هەر لەسەرستەم بەردەوامە.

بۆیە ئەو دەسەڵاتدارە کەوتە پیلان دانان بۆ ئیمامی (شافعی)، تا دواجار خەلیفەی موسوڵمانانی واتێگەیاند، کە ئیمامی (شافعی) دژی خەلیفەی موسوڵمانانە، خەلیفەش داوای کرد ئیمامی (شافعی) بهێنن بۆ (*بغداد*)، کاتێک (شافعی) چوو بۆ لای خەلیفە بەبەڵگە پێی سەلماند، کە بێتاوانە، یەکێک لە دادوەر و زانا گەورەکانیش شایەتییدا بۆ ئیمامی (شافعی)، ئیتر باش بوو ئیمامی (شافعی) پارێزراو خوای

گەورە رزگاری کرد و پیلانەکەی ئەو دەسەڵاتدارە ستەمکارە سەری نەگرت.

ئیتر ئیمامی (شافعی) نەگەڕایەوە بۆ (یمن)، بەڵکو هەر لە (بغداد) مایەوە و کەوتە وەرگرتنی زانستی زیاتر، لەگەڵ ئەوەشدا وانەی دەوتەوە و چەندین خوێندکاری پێگەیاند کە ئەوانە زۆرێکیان بوون بەکەسی گەورە و هەڵکەوتەی ناو موسوڵمانان.

دوای ئەوە ئیمامی (شافعی) گەڕایەوە بۆ (مكة)و لە مزگەوتی کەعبەی پیرۆز دەستی کردەوە بە وانەوتنەوە، لەوێ موسوڵمانانێکی زۆر لە وانەکانیدا ئامادە دەبوون، جگە لەوەی ئەوانەی دەچوون بۆ حەج، دەچوونە خزمەتی و زانستیان لێوەردەگرت، ئەوەش هۆکارێکی گەورە بوو تا ئەو ئیمامە گەورەیەی ئیسلام زانستی خۆی ببەخشێت بە بەشێکی زۆری موسوڵمانان.

دواجار ئیمامی (شافعی) لە مانگی رەجەبی ساڵی ٢٠٤ کۆچی و لە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، مردنەکەشی لە شەوی هەینیدا بوو، بۆ بەیانی، کە ڕۆژ بوویەوە تەرمەکەی نوێژی لەسەرکرا و خەڵکێکی زۆر و بێشومار ئامادە بوون و خرایە ناو گۆڕ.

ئیمامی (شافعی) لە مانگی ڕەمەزاندا زۆر زیاتر خۆی

یەکلا دەکردەوە بۆ پەرستشی خوای گەورە و زیاد لە هەمووان قورئانی دەخوێند، ئیتر لە شەو و ڕۆژێکدا خەتمێکی قورئانی پیرۆزی دەکرد.

ئیمامی (شافعی) دوای خۆی چوار منداڵی بەجێهێشت کە ئەوانیش (ابو عثمان، فاطمە، ابو حسن، زینب) بوون.

**پەندو وانە**

(قـودس) خـاکی موسـوڵمانانە و یەکەم جـاریش قیـبلەی موسـوڵمانان (قـودس) بـووە، بـۆیە ئەو خـاکە یەکـێکە لە خۆشەویستترین ناوچەکانی سەر زەوی، لە سەردەمانی پێشوودا لە لایەن سـەرکردەی موسـوڵمانان (صـلاح الـدین أیـوبي)یەوە، کە سەرکردەیەکی کورد بوو (قودس) رزگـار کرا، بەڵام ماوەیەکی زۆرە جوولەکەکان ئەو ناوچەیان داگیر کردووە و ئێمەش وەک موسوڵمان دەبێت لە بیرمان بێت، کە هەر دەبێت ڕۆژێک بێت ئەو شـوێنە رزگـار بکەیـن و بیگێـڕینەوە بـۆ ژێـر دەسـتی موسوڵمانان.

نابێت هەرگیز وا بیر بکەینەوە بڵێین ئێمە منداڵین و ناتوانین زانسـتی زۆر وەربگـرین و نـابین بە زانـا، بەڵکـو وەک دەبینـین زۆربەی زانایـانی ئیسـلام هەر بە منـداڵی زانسـتی زۆریـان وەرگرتـووە، بـۆیە ئـێمەش ئەگەر پشـت ببەسـتین بەخـوای گەورە دەتـوانین ئـێمەش زانسـتێکی زۆر وەربگـرین و ببیـنە کەسـی وا، کە زانستی زۆرمان پێبێت.

ژیـانی زۆربەی زانایـانی ئیسـلام پـڕ بـووە لە نـاڕەحەتی و هەژاری و ئەوان بەنەبـوونی مـاددی ژیـاون، بەڵام هەموویـان بەوە

ڕازی بوون و شوکری خوایان کردووە، چونکە مادده و سامانی دونیا بۆ ماوەیەکی کاتییە، هەموو ئەوانەی کاتی زوو پارە و سامانیان هەبوو سامانەکەیان نەماو لە ناوچوون، بەڵام ئەوانەی زانا بوون، تا ئەمڕۆش زانستەکەیان ماوە و موسوڵمانان ڕەحمەتیان بۆ دەنێرن و نزای خێریان بۆ دەکەن.

هەمیشە گومانی خێرمان هەبێت بەو ڕووداوانەی دێنە ڕێگەمان، چونکە خوای گەورە زۆر جار کار و ڕووداوێک دێنێتە رێگەمان، کە لەوانەیە خۆمان پێمان خۆش نەبێت، بەڵام لە بنەڕەتدا ئەوە چاکترین شتە بۆمان، وەک دەبینین کاتێک ئیمامی (شافعی) لە (یمن)ەوە بانگ کرا بۆ (*بغداد*) تا دەسەڵاتی لێوەربگیرێتەوە، بەڵام ئەو ڕووداوە بوو بە خێر تا بە یەکجارەکی تاو بداتە بواری زانست و لایەنەکانی تر پشتگوێ بخات، بەوەش بوو بەو زانا گەورەیەی، کە تا ئەمڕۆش هەموومان قەرزاری هەوڵ و زانستی ئەوین.

مردن دێتە ڕێی هەموو کەس و نابێت هەرگیز مردنمان لە بیر بچێت، بەڵکو دەبێت ئەوە بەدەرفەت وەربگرین، تا لە ژیاندا ماوین خزمەتی چاک بکەین و خێر و چاکە کۆبکەینەوە بۆ ڕۆژی دواییمان، چونکە کەسی ژیر ئەوەیە چاکە پێش خۆی بخات بۆ ڕۆژی دوایی، تا لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە بەهەشتی پێ ببەخشێت.

## پرسیارەکان

١. ائیمامی (شافعی) ناوی چی بوو؟ لە کویّ لە دایکبووە؟
٢. ئایا دەزانیت ئیمامی (شافعی) لە تەمەنی منداڵیدا چی کرد؟
٣. بۆچی ئیمامی (شافعی) چوو بۆ (یمن)؟
٤. پەیوەندی نێوان ئیمامی (مالک) و ئیمامی (شافعی) چۆن بوو؟ باسی بکە.
٥. خەلیفەی موسوڵمانان بۆچی ئیمامی (شافعی) بانگ کرد بۆ (بغداد)؟
٦. ئایا ساڵی مردنی ئیمامی (شافعی) دەزانیت؟
٧. بەچی شتێکی ئیمامی (شافعی) سەرسام بویت؟

## ئیمامی احمد

منداڵانی ئازیز و چاوگەش، ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت باسی بکەین ژیانی یەکێکە لەو زانا گەورانەی ئیسلام، کە تا ئەمڕۆش بەشێکی زۆری موسوڵمانانی جیهان بەپێی نووسین و فەتواکانی ئەو دەجووڵێنەوە و سوودی زۆریان وەرگرتووە لە زانستی پڕ سوودی ئەو زانایە، ئەویش هەموو زانستی خۆی لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) وەرگرتووە، ئەوەشی لای زانایان و مامۆستاکانی وەرگرتووە و دواتر هەوڵی زیاتری داوە و زانیاری زیاتری پەیدا کردووە و توانیویەتی خزمەتێکی گەورە پێشکەش بەموسوڵمانان بکات، ئەویش ئیمامی (احمد)ە.

ئەم زانایە ناوی (احمد)ە و باوکیشی ناوی (محمد)ە، دایکیشی ناوی (صفیە)یە، بەڵام ئیمامی (احمد) کاتێک ناوی

دەبرێت دەڵێن: (احمد بن حنبل)، نەوەک بڵێن (احمد بن محمد).

پرسیار: بۆچی بە (احمدی بن حنبل) ناوی دەبەن لە کاتێکدا باوکی ناوی (محمد) بووە؟

وەڵام: چونکە باوکی سەربازێکی موجاهیدی ڕێگەی خوا بووەو زۆر ناسراو نەبووە، بەڵام باپیری ناوی (حنبل) بووە کە دەسەڵاتدارێکی باوەڕداری ناسراو بووە، ئیتر بۆیە کاتێک ناوی ئیمامی (احمد) دەبرێت بەناوی باپیریەوە ناوی دێنن نەک بەناوی باوکییەوە.

(احمد) لە ساڵی ١٦١ کۆچی لە شاری (بغداد) لە دایکبووە، کاتێک لە سکی دایکیدا بوو باوک و دایکی لە شاری (مەروە)وە، کۆچیان کرد بۆ (بغداد)، ئیتر ئیمامی (احمد) لەوێ لە دایکبووە، ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو تا لەوێ گەورە زاناکانی ئیسلام بناسێت چونکە ئەو کات (بغداد) پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو.

هەر لە تەمەنی منداڵیدا بوو، کە باوکی کۆچی دوایی کرد، ئیتر (احمد) ژیانێکی هەتیوانە و بێ باوکی بەسەربرد و دایکی باوەڕداریشی هەوڵی دەدا قەرەبووی نەبوونی باوکی بکاتەوە، بەوەی ڕۆڵی دایکێک و باوکێکیشی بۆ ببینێت، بۆیە ژیانی سەرەتا و منداڵی (احمد) پڕ لە ناڕەحەتی بوو.

بەڵام ئەوە نەبووە بەربەرست لە بەردەم (احمد) دا، بەڵکو ئەو زۆر حەزی دەکرد بە زانست، بۆیە خێرا چووە خزمەت مامۆستایان و وانەی لەلایان دەخوێند، ئەوەبوو هەموو قورئانی پیرۆزی خوێند و لەبەری کرد، زانستێکی زۆری ئیسلامی خوێند، ئینجا ئیتر بەرە بەرە بڕیاریدا دەست بکات بە لەبەرکردنی فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، بۆ ئەوە بەردەوام دەچوو بۆ لای مامۆستاکانی.

ئیمامی (احمد) بۆ وەرگرتنی فەرموودە شارە جیاجیاکانی (عراق) گەڕا، هەروەها چوو بۆ (یمن)، تا لەوێ لە مامۆستاکانی فەرموودەی ئەو وڵاتە فەرموودە وەربگرێت، هەروەها چوو بۆ (مکة)، لەگەڵ ئەوەشدا چوو بۆ وڵاتی (شام). بەڵێ، (احمد) ئەو هەمووە شوێنانەی دەکرد تەنیا بۆ ئەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ببیستێت و بیاننووسێتەوە و وەریان بگرێت، زۆرجار بەشێکی زۆری ئەو گەشتانەی بەپیادە دەکرد، چونکە پارەی کەمی هەبوو و توانای ئەوەی نەبوو بە دڵی خۆی پارە خەرج بکات و بە ئیسراحەت بڕوات، ئەو دەیزانی ئیش کردن باشە، بەڵام بڕیاری دابوو لەبری ئەوەی ئیش بکات کاتەکەی بدات بەبواری فەرموودە تابتوانێت ببێتە زانایەکی گەورە و لە ئایندەدا سودێکی زۆر بگەیەنێت بە

موسڵمانان، بەوە هەم چاکە زیاد دەکات بۆ باوکی و دایکی، لە بەرئەوەی ئەوان وا بەموسوڵمانی پەروەردەیان کردووە، هەم چاکەکە بۆ خۆیشی دەمێنێتەوە، هەم زانستەکەشی دەبێتە مایەی خێرو خۆشی و سوود بۆ خەڵکی تر، تەنانەت بۆ ئەوانەش، کە دوای مردنی خۆی دێنە دونیا.

ئیمامی (احمد) هێندە حەزی لە وەرگرتنی زانست بوو، بەیانی زۆر زوو خۆی ئامادە دەکرد و دەچوو بۆ لای ماممۆستاکانی، ئیتر جاری وا هەبوو دایکی جلەکانی (احمد)ی دەشاردەوە بۆئەوەی ئەوەندە زوو نەڕوات، بە(احمد)ی دەوت: کوڕی شیرینم پەلە مەکە با مامۆستاکانت لە خەو هەستن ئینجا بڕۆ.

ئیمامی (احمد) خوێندکارێکی زیرەکی ئیمامی (شافعی) بوو، ئیمامی (شافعی)ش ئەوی زۆر خۆش دەویست و ڕێزی دەگرت، تەنانەت هێندە خۆشی دەویست لە سەفەرێکی بۆ(مکة)ی پیرۆز لەگەڵ ئیمامی (احمد) و کەسێکی تر بەیەکەوە چوون.

ئیمامی (شافعی) زۆر سەرسام بوو بەزانستی ئیمامی (احمد) هەرچەندە (احمد) خوێندکاری بوو، تەنانەت جارێک دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر نەیدیبوو داوای کرد لە (احمد)ی خوێندکاری، ئەگەر فەرموودەیەکی صەحیحی لای مامۆستایەک بەدی

کرد، پێی بڵێت، تا ئەویش بچێت وەریبگرێت، واتە: ماموستاکەی پێی شەرم نەبوو زانستێک لە خوێندکارەکەیەوە فێر ببێت، چونکە ئەو کەسانە مەبەستیان ناوبانگ و قسەی خەڵک نەبووە، بەڵکو ئەوەی لایان گرنگ بوو، ڕەزامەندی خوای گەورە بوو، ئەوان مەبەستیان بوو سوود بگەیەنن بە خەڵک و بە پوختی زانستە دروستەکانیان بخەنە بەردەست.

ئیمامی (شافعی) بڕیاریدا بچێت بۆ (مصر) و (عراق) جێبهێڵێت، تا سوود بگەیەنێت بە خەڵکی (مصر)یش، ئەوەبوو ئیمامی (احمد) بەڵێنی پێدا بچێت بۆ لای ماموستاکەی لە (مصر)، تا لەوێش زانستی لێوەربگرێت، بەڵام هەر نەچوو.

پرسیار: بۆچی (احمد) بەڵێنی دا بچێت بۆ لای ئیمامی (شافعی) کەچی نەچوو؟

وەڵام: چونکە پارەی نەبوو و نەیدەتوانی بڕوات، ئیتر لە بەرئەوە نەچوو نەوەک لەبەر کەمتەرخەمی.

لەو ماوەدا، کە (احمد) خوێندکار بوو سەربازانی موسوڵمان، نامەیان دەنووسی بۆ ژن و منداڵەکانیان، هەندێک لەو ژنانە نەخوێندەوار بوون، بۆیە داوایان دەکرد لە (احمد)، تا نامەکەیان بۆ بخوێنێتەوەو وەڵامی نامەکەیان بۆ بنووسێت، ئەویش سەری دادەنەواند تا گوناهبار نەبێت بەسەیرکردنیان، هەرچییەکیشیان

بوتایە، کە شەرعی نەبوایە نەیدەنووسی بۆیان، چونکە ئەو کارەی لەبەر خوای گەورە دەکرد، بۆیە نەیدەهێشت شتێک بنووسن بۆ هاوسەرەکانیان کە خوای گەورە پێی ڕازیی نەبێت.

(احمد) هەرچەندە گەورە ببوو و وەک زانایەکی گەورەش سەیر دەکرا، بەڵام منداڵانی لە بیر نەدەکرد، جار هەبوو یاری دەکرد لەگەڵیاندا، تا دڵیان خۆش بکات، ئەوەبوو جارێکیان نەعلەکانی گرت بەدەستییەوە و لەگەڵ منداڵەکان ڕای دەکرد و یاری دەکرد، یەکێک لە کەسە گەورەکان وتی: (احمد)، تا کەی واز ناهێنیت لە یاری کردن لەگەڵ منداڵان؟

ئەویش وتی: تا ئەو ڕۆژەی دەمرم واز ناهێنم لە یاری کردن لەگەڵ منداڵان.

ئیمامی (احمد) هەرچەندە لە ڕووی ماددیەوە زۆر هەژار بوو، بەڵام زۆر دەروونی بەرز بوو و هیچی لە کەس وەرنەدەگرت، ئەوەبوو جارێکیان گەنجێکی بانگکرد و بڕێک پارەی پێدا، تا هەندیک کاغەزی بۆ بکڕێت، گەنجەکەش کاغەزەکانی بۆ کڕی و دواتر حەزی کرد یارمەتی ئەو ئیمامە بدات، چونکە هەموو کاتی خۆی داناوە بۆ زانست و خزمەتکردنی خەڵک، بۆیە بڕێک پارەی خستە ناو کاغەزەکان و بردیەوە بۆ ئیمامی (احمد) و خێرا چووە دەرەوە، کاتێک ئیمامی (احمد) کاغەزەکانی کردەوە بینی بڕە پارەیەکی تێدایە، خێرا پارەکەی

هەڵگرت و پرسیاری کرد، ماڵی ئەو کوڕە لە کوێیە، کاتێک پێیان وت کە لە کوێیە، چوو بۆ ماڵیان و پارەکە و کاغەزەکانیشی پێدا و گەڕایەوە، هەرچەندە گەنجەکە وتی: خۆ کاغەزەکانم بەپارەی خۆت کڕیوە، کەچی ئیمامی(احمد)کاغەزەکانیشی وەرنەگرتەوە.

**پرسیار: ئەی ئیمامی (احمد) بەچی دەژیا؟**

وەڵام: ئیمامی (احمد) باوکی خانوویەکی بۆ بەجێ هێشتبوو، هەروەها کرێیەکی کەمی مانگانەشی بۆبەجێ مابوو، جارجارەش دەچوو کرێکاری دەکرد، هەروەها جاری وا هەبوو ناچار دەبوو لە هەندێک کەس قەرز بکات بەڵام زۆر کەم قەرزی دەکرد، جاری وایش هەبوو کە کەسێک کشتوکاڵەکەی خۆی دەچنییەوە و ئینجا وازی لێدەهێنا، ئیمامی (احمد) دەچوو مۆڵەتی وەردەگرت و پاشماوەی بەجێماوی کۆ دەکردەوە بۆ خۆی.

ئیمامی (احمد) لە تەمەنی چل ساڵییدا ژنی هێنا، خوای گەورەش منداڵێکی زیرەکی پێبەخشین، کە ناوی (عبدالله) بوو، ئەو منداڵەشی شوێن پێی باوکی هەڵگرت و فەرموودەی وەردەگرت و بەردەوام لای باوکیشی وانەی دەخوێند و بڕێک فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.

ئیمامی (احمد) دووچاری تاقیکردنەوەیەکی خوایی بوو،

ئەویش ئەوەبوو دەسەڵاتداری ئەو کاتەی موسوڵمانان وا تێگەیەنرا بوو، کە قورئانی پیرۆز دروستکراوی خوایە، بۆیە دەیوت دەبێت ئیمامی (احمد)یش وابڵێت، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو ئەوە بڵێت و دەیوت: قورئان فەرمایشتی خوای گەورەیە، لەسەر ئەوە بەندکرا، ئەوەبوو ئازارێکی زۆر درا، بەڵام ئیمامی (احمد) خۆڕاگر بوو و بۆچوونەکەی خۆی نەگۆڕی، ئامادەش نەبوو بەموسوڵمانان بڵێت دژی سەرکردەی موسوڵمانان ڕاپەڕن، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاژاوە نەکەوێتە ناو وڵاتی موسوڵمانانەوە، بەڵام دواجار ئازاد کرا.

پاش ماوەیەک ئیمامی (احمد) لە ساڵی ٢٤١ کۆچیدا تووشی نەخۆشی بوو و تایەکی زۆری هەبوو، ئیتر خەڵکی دەهاتن بۆ سەردانی، تەنانەت ئەوانەش ئازاریان دابوو دەهاتن داوای گەردن ئازادیان لێ دەکرد، تا ئەوەی ڕۆژی مردنی هات.

(عبدالله) کوڕی لای بوو، بیستی باوکی دەیوت جارێ نا، وتی باوکە گیان ئەوە چی دەڵێیت؟

وتی: کوڕم ئەوە شەیتانە دەڵێت (احمد) تۆم لە دەست دەرچوو نەمتوانی لە خشتەت بەرم.

منیش وتم: نا جارێ، تا نەمرم رزگارم نابێت لە دەست پیلانی تۆ.

دواجار ئیمامی (احمد) بە باوەڕداری گەڕایەوە بۆ لای

پەروەردگاری و کۆچی دوایی کرد و موسوڵمانانیش تەواو دڵگرانی دایگرتن، خەڵکێکی زۆر زۆریش نوێژیان لەسەرتەرمەکەی کرد، بەجۆرێک، تا ئەو کاتە شتی وا نەبینرابوو، ئەو ڕۆژەش کە وەفاتی کرد ڕۆژی هەینی بوو، لە (بغداد) خرایە ناو گۆڕ و زیاتر لە یەک ملیۆن کەس ئامادە بوون.

**پەندو وانە**

نەبوونی باوک یان دایک شتێکی ناخۆش و ئازار بەخشە، بەڵام ئەوە نابێتە بەربەست بۆ ژیان و دەبێت بەوە چۆک دانەدەین، بەڵکو کارێک بکەین ببێتە مایەی خێر بۆ ئەوانیش و بەردەوام نزایان بۆ بکەین، چونکە دەبینی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، هەر بەمنداڵی دایک وباوکی لە دەستداوە، بەڵام خۆڕاگر بووە، تا خوای گەورە خێری هێناوەتە ڕێی، هەروەها دەبینین ئیمامی (احمد) بەمنداڵی باوکی مردووە، بەڵام هەوڵیداوە تا بووە بەو زانا گەورەیە، بەوەش چاکەی زۆری بۆ چووە بەهۆی منداڵەکەیەوە.

هەوڵدان بۆ زانست هەنگاوێکی زۆر گەورە و پڕ شانازیە و هەرگیز مرۆڤ لێی پەشیمان نابێتەوە، چونکە هەم خوا پێی ناخۆشە و هەم هەموو دروستکراوەکانی تری خوای گەورە نزای

خێر دەکەن بۆ ئەو کەسە، هەم لای بەندەکانی خواش خۆشەویست دەبێت و خەڵکیش بەرێز و گەورەییەوە سەیری دەکەن، مرۆڤی زانا هەمیشە دەبێتە مایەی خێر بۆ دەوروبەرەکەی.

دەبێت خوێندکار زۆر ڕێزی مامۆستای بگرێت و بەچاوی پڕ لە ڕێزەوە سەیری بکات، چونکە مامۆستاکەی زانستی پێبەخشیوە، ئەوەش چاکترین شتێکە کەسێک بیبەخشێت بەکەسێکی تر، بۆیە دەبێت نرخی بزانێت و لە بەرچاوی بێت ئەو مامۆستایە ئەوەندە ئەوی خۆش ویستووە حەزی کردووە چی دەزانێت بە ئەویشی بڵێت و ئەویش فێر بکات.

ئەگەر خوێندکارێک شتێکی باشی زانی، با بەرێزەوە بە مامۆستاکەی بڵێت و ئەوە هیچ شەرمی ناوێت، وەک چۆن ئیمامی (شافعی) داوای کرد لە خوێندکارەکەی خۆی ئیمامی (احمد)، تا ئەگەر فەرموودەیەکی ڕاست و دروستی زانی لای کەسێکە پێی بڵێت، تا بچێت بۆی ئەگەر تەنانەت لە ولاتانی دووریش بێت.

دەبێت هەمیشە وریای ئاشتی و خۆشی موسوڵمانان بین و خۆمان بپارێزین لە فیتنە و ئاژاوە نانەوە، وەک چۆن ئیمامی (احمد) هەرچەندە بەندیش کرابوو کەچی نەیدەهێشت بەهۆی ئەوەوە موسوڵمانان کێشە بکەوێتە نێوانیانەوە.

## پرسیارەکان

١- بۆچی ئیمامی (احمد) بە کوڕی (حنبل) ناسراوە؟
٢- ئیمامی (احمد) لە ساڵی چەند و لە کوێ لە دایکبووە؟ ئەی لە ساڵی چەند وەفاتی کرد؟
٣- پەیوەندی نێوان ئیمامی (احمد) و ئیمامی (شافعی) چۆن بوو؟
٤- بۆچی ئیمامی (احمد) بەڵێنەکەی خۆی لەگەڵ ئیمامی (شافعی) نەبردە سەر کە بەڵێنی دابوو بچێت بۆ (مصر) بۆ لای؟
٥- بۆچی ئیمامی (احمد) خرایە بەندنیخانەوە؟
٦- شەیتان لە کاتی مردنی ئیمامی (احمد)دا چی پێ وت؟ ئیمامی (احمد) چۆن وەڵامی دایەوە؟
٧- ئەم چیرۆکە باس بکە بۆ یەکێک لە خۆشەویستەکانت.

# ابن منده

لە (ئێران) شارێکی جوان و ڕازاوە هەبوو، شاری باوەڕداران و زانایانی ئیسلام، شارێک بەردەوام زانای پێدەگەیاند تا خزمەتی پەیامی خوا بکەن، ئەویش بریتی بوو لە شاری (اسفهان).

نزیکەی هەزار ساڵ لە مەوبەر بنەماڵەیەک لەو شارەدا دەژیان، کە ناسرابوون بەبنەماڵەی (ابن منده)، بنەماڵەیەک بوون زۆر باوەڕدار و زانا بوون، هەموویان تەمەن و ژیانی خۆیان بەزانستی فەرموودەوە لای زانایان سەرف دەکرد، فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایان دەبیست و وەریان دەگرت و دەیاننوسیەوە و بەوانە بەخەڵکی تریان دەوتەوە و ڕاستیەکانیان تێدەگەیاندن.

یەکێک لە زاناکانی ئەو بنەماڵەیە ناوی (اسحاق) بوو، (اسحاق) برایەکیشی هەبوو، کە زۆر زانا بوو و وانەی بەخەڵک دەوتەوە.

(اسحاق) زانای ناسراوی بواری فەرموودە بوو، کە گەیشتە کاتی خۆی ژنی هێنا و خوای گەورەش، پاش ماوەیەک

منداڵێکی جوان و زیرەکی پێبەخشین.

پرسیار: ئەو منداڵە کەی لە دایکبووە؟

وەڵام: ئەو منداڵە لە ساڵی ٣١٠ کۆچی لە دایکبووە.

پرسیار: ئەو منداڵە ناوی چی بوو؟

وەڵام: ئەو منداڵە ناوی (محمد) بوو، بەڵام لە بەرئەوەی دواتر زۆر زیرەک و زانا دەرچوو هەر بەناوی بنەماڵەکەیەوە ناسراوە و خەڵکی، کە ناوی دەبەن پێی دەڵێن (ابن مندە).

دایک و باوکی هەر لە منداڵییەوە کەوتنە نازکێشان و پەروەردەکردنی ئەم منداڵەیان، وەک چۆن دایکی شیری پێدەدا باوکیشی زانستی پێدەبەخشی، ئیتر بوو بەمنداڵێکی زیرەک و شارەزا.

(ابن مندە) تەمەنی هەشت ساڵ بوو، کە فەرموودەی لە باوکی وەرگرت و کەوتە گەڕانی ورد بەدوای زانستدا، ئیتر ڕۆژانە دەچووە لای باوکی وانەی دەخوێند، دواتر دەچوو بۆ لای مامیشی کە ئەویش زانایەکی گەورە بوو وانەی دەخوێند، دواتریش فەرموودەکانی بە لە بەرکردنەوە دەوتەوە تا لە بیری نەچنەوە.

لە بەرئەوەی باوکی زانایەکی ناسراو بوو بۆیە زۆربەی زاناکانی شارەکە تێکەڵییان دەکرد، ئەمە دەرفەتێکی باش بوو

بۆ (ابن منده)، تا ئەو زانایانە بناسێت و زانستیان لێوەربگرێت، هەر بۆیە باوکی داوای لەو زانایانە وانە بە کوڕەکەی بڵێنەوە، ئەوانیش ڕازی بوون.

ئیتر (ابن منده) ڕۆژانە دەچوو بۆ لای ئەو زانایانە و فەرموودەی لەوان دەبیست و زانستی تریشی وەردەگرت، خوێندکارێکی زیرەک بوو، پێویستی نەدەکرد ماموٚستاکانی بە زۆر وانەکانی پێبڵێن، بەڵکو بەخۆشحاڵییەوە ڕۆژانە خۆی ئامادە دەکرد و دەچوو وانەکانی دەخوێند، چونکە ئەویش ئاواتی ئەوە بوو ببێتە زانایەکی گەورە و خەڵکی فێری چاکەکاری بکات و کێشەی خەڵک چارەسەر بکات و منداڵان و گەنجانی دەوری خۆی پێبگەیەنێت.

دوای ماوەیەک، کە زانستی چاکی لە ماموٚستاکانی وەرگرت، (ابن منده) بڕیاریدا بچێتە دەرەوەی وڵاتی خۆی تا زانست لەوانیش وەربگرێت، کۆڵ و باری بچووکی خۆی پێچایەوە و کەوتە ڕێ، بۆ دەرەوەی وڵاتان، ئیتر هێندە گەڕا، تا نزیکەی هەزار و حەوت سەد ماموٚستای بینی و لە خزمەتیاندا وانەی خوێند، لەو ماوەیەدا (ابن منده) بۆ وەرگرتنی زانست هەر یەک لەم شوێنانەی کرد:

(اسکندریە، ترابلوس، بخارا، *بغداد*، بیت المقدس، بیروت،

بیکند، تننیس، حیمص، دمشق، صیدا، توس، غزه، قولزوم، قیساریه، کوفه، مرو، مصر، مکة، نیشاپوور، همدان).

(ابن منده)، کە کاتی خۆی هات ژنی هێنا، ژنەکەشی ناوی (اسما) بوو، ئەویش ئافرەتێکی خواناس و شارەزا بوو، خوای گەورەش چوار منداڵی بەخشی بەو خێزانە، هەرچوار منداڵەکەشی زانا و کەسی هەڵکەوتە دەرچوون و شوێن پێی باوکی خۆیان گرتەبەر لەوەرگرتنی زانستدا، دواتر کە ئەوانیش منداڵیان بوو هەر وەک باوکیان کەوتنە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان و هەموو منداڵەکانیان بۆ دوارۆژ بوون بەزانای گەورە، واتە بنەماڵەکەیان هەموویان وا پەروەردە دەکران دەبوون بەزانای گەورە و خواناس.

پرسیار: ناوی منداڵەکانی چی بوون؟

وەڵام: ناوی منداڵەکانی (عبدالرحمان، عبدالوهاب، عبیدالله، عبدالرحیم)بوو.

(ابن منده) هێندە زانایەکی گەورە دەرچوو، کە زاناکانی تر زۆر پێی سەرسام بوون، دەبینین (ابراهیم اسفهانی)، کە مامۆستایەکی (ابن منده) بوو باسی (ابن منده)ی دەکرد و دەیوت:"کەسی وەک ابن مندەم نەدیوە".

هەروەها (ابو اسماعیلی انصاری) کە زانایەکی گەورە بوو

سەبارەت بە (ابن منده) دەیوت: " ابن منده گەورەی کەسانی سەردەمی خۆی بووە".

(ابن منده) هەمیشە موسڵمانانی ئاگادار دەکردەوە لە هەڵەی خەڵکی گومڕا و نەزان و ڕاستیەکانی ڕوون دەکردەوە، ئەوانەی بە ئارەزووی خۆیان باسی ئیسلامیان دەکرد بەردەوام (ابن منده) وەڵامی دەدانەوە و هەڵە و پیلانە چەوتەکانیانی لە ناو دەبرد.

(ابن منده) چەندین کتێبی نووسی سەبارەت بەئایینی ئیسلام، بۆ خزمەتکردنی موسوڵمانان، هەندێکیان ڕوونکردنەوەی یەکخواپەرستییان تێدا بوو، هەندێکیان وەڵامی ناڕاستیەکانی خەڵکی گومڕایان تێدا بوو، یەکێک لە کتێبە دیارەکانیشی تایبەت بوو بە باسی ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، چونکە ئەو دەیزانی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، گەورەترین کەسان و مامۆستا بوون، کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئاینی ئیسلامیان گەیاندووە بە مرۆڤایەتیی، بۆیە دەیویست ژیانی هاوەڵان بەهەمووان بگەیەنێت.

پرسیار: ناوی کتێبەکەی (ابن منده) چی بوو، کە لەسەر هاوەڵان نووسیبووی؟

وەڵام: ناوی ئەو کتێبەی نابوو (معرفه الصحابه) واتە: ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

بەرەبەرە (ابن منده) پیر بوو، تا کاتی ئەوە هات خوای گەورە

بیگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی، واتە ئیتر دەبوو دونیا جێبهێڵێت و بمرێت، ئەوەبوو لە تەمەنی ٨٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**پەند و وانە**

- دەبێت هەمیشە بەدوای زانستدا بگەڕێین و هەوڵ بدەین مامۆستای شارەزا پەیدا بکەین و داوایان لێبکەین، تا زانستمان پێ ببەخشن، تا ئێمەش ببینە زانا و خزمەتی خەڵکی بکەین.
- لە ناو ئیسلامدا هەموو نەتەوەکان جێیان ئەبێتەوە و قبووڵ کراون، ئیتر لە خواترسان بەپێی ڕەنگ و نەتەوە نییە، بەڵکو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیسلامدا لە خوا ترسان و پەیڕەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ کات ئیسلام جیاوازی ناکات، لە نێوان کورد، عەرەب، تورک، فارس و ئینگلیز و هەر نەتەوەیەکی تردا، بەڵکو جیاوازیەکە لەسەرئەوەیە کامیان کاری چاکە زیاتر بکات.
- پێویستە زۆر خۆمان سەرقاڵ بکەین بە ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و پەند و وانە لە ژیانیان وەربگرین و باسیشی بکەین بۆ دەوروبەرمان.
- دەبێت هەر کەس هەڵەی کرد، بەدڵسۆزی و ژیرانە هەڵەکەی بۆ ڕاست بکەینەوە بەجۆرێک، کە نەبێتە هۆکاری ئابڕوو بردنی، بەڵام ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر هەڵەکەی دەبێت چواردەورمان ئاگادار بکەین لە هەڵەکەی، تا پێی هەڵنەخەڵەتێن.

**پرسیارەکان**

١- (ابن منده) ناوی چی بوو؟ ئەی بۆچی پێی دەوترا (ابن منده)؟
٢- (ابن منده) لە ساڵی چەند لە دایکبووە؟ ئەی لە تەمەنی چەند ساڵیدا فەرموودەی وەرگرت؟
٣- دەتوانیت ناوی چەند شوێنێک بڵێیت کە (ابن منده) چوو بۆیان تا زانست وەربگرێت؟
٤- کتێبی (معریفه الصحابه)ی (ابن منده) باسی چی دەکرد؟
٥- (ابن منده) لە تەمەنی چەند ساڵییدا کۆچی دوایی کرد؟
٦- دەتوانیت ژیانی (ابن منده) بۆ یەکێک لە خۆشەویستەکانت باس بکەیت؟
٧- گرنگترین شتێک کە
٨- لە ژیانی ئەم زانایە فێر بوویت چی بوو؟

# عمر بن عبدالعزیز

ئەم باسەی لێرەدا دەیخەینە ڕوو باسی ژیان و بەسەرهاتی یەکێک لە گەورە هەڵکەوتەکانی ئیسلامە، کە هەم لە لایەکەوە زانایەکی گەورە بووە و هەم خەلیفە و سەرکردەی موسوڵمانان بووە، ئەوەش گەورەییەکی زۆرە، کەخوای گەورە لە یەک کاتدا ئەو دوو هەڵکەوتەییەی پێبەخشییوە، ئەویش (عمر بن عبدالعزیز)ە، ئەم (عمر)ە جیایە لە ئیمامی (عمر أبن خطاب) کە خەلیفەی دووەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، بەڵام هەر لە نەوەی ئیمامی عومەر بووە.

ناوی باوکی (عبدالعزیز) ە، دایکیشی ناوی (لیلی)یە، باپیری (لیلی) ئیمامی (عمر بن خطاب)ە، واتە: ئیمامی (عمر) باپیری دایکی عومەری کوڕی (عبدالعزیز)ە.

کاتی خۆی ئیمامی (عمر) شەوێک بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا، بینی کچێک و دایکێک سەرقاڵن، شیر ئامادە دەکەن بۆ بەیانی، تا بیفرۆشن.

ئەوەبوو دایکی بە کچەکەی وت: کچەکەم ئاوی زۆری تێبکە با شیرەکە زۆر بێت و پارەی زیاتر بکات.

ئەویش وتی دایکە وا ناکەم.

دایکی وتی: خۆ (عمر)ی خەلیفەی موسوڵمانان نامانبینێت.

کچەکەی وتی: دایکە گیان خۆ ئەگەر (عمر) نەمانبینێت ئەوا خوای گەورە دەمانبینێت، بۆیە ئیمامی (عمر) بەوە سەرسام بوو و بڕیاری دا داوای ئەو کچە بکات بۆ کوڕێکی، لە نەوەی ئەو کوڕەی (عمر) و ئەو کچە، ئەم منداڵە ئازیزە لە دایکبووە کە ناونرا (عمر) و وەک باپیرە گەورەی هەم بوو بەزانایەکی گەورە و هەم بوو بە خەلیفەی موسوڵمانانیش.

عومەر لە ساڵی ٦١ کۆچی، لە شارەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شاری (مدینة)ی خۆشەویست لە دایکبووە، ئەو شارەی کە مەڵبەند و لانەی زانایانی گەورەی ئیسلام بوو، لە ناو شارە شیرینەکەی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) زانایانێکی زۆر دەرکەوتن، چونکە ئەو شارە شاری هاوەڵانی ئازیز بوو، هەم پشتیوانان و هەم کۆچەرانیش لەوێ بوون، زانایانێک دەرکەوتن، کە لە خزمەت هاوەڵان یان خوێندکارانی هاوەڵاندا زانستیان وەرگرتبوو بۆیە زانستەکەیان زۆر ڕاست و بێگومان بوو.

ئیتر (عمر) لەو شارەدا لە دایکبووە، هەر لەوێش لەسەر دەستی ئەو زانایانە زانستی وەرگرت، بۆیە خوای گەورە کردی بەو کەسە هەڵکەوتەی ئیسلام، ئیتر ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە و لای زانایانی ئەو شارە زانستی وەرگرت بەتایبەت زیاتر لای مامۆستایەکی بوو بە ناوی (صالح).

دواتر مامی، کە خەلیفەی موسوڵمانان بوو و ناوی (عبد الملك) بوو و لە (دمشق)، سەرکردایەتی دەوڵەتی ئیسلامی دەکرد، داوای کرد (عمر)ی برازای بچێت بۆ (دمشق) بۆ لای، ئەوەبوو (عمر)یش چوو بۆ ئەوێ و هەر لەوێش پاش ماوەیەک مامی کچێکی هەبوو کە ناوی (فاطمە) بوو ئەو کچەی پێشکەش کرد بە (عمر) و پرۆسەی هاوسەرێتییان ئەنجامدا، واتە خێزانی (عمر بن عبدالعزیز) ئامۆزای خۆی بوو.

(عبدالملك)ی مامی زۆر مەبەستی بوو ئەو برازایەی وەک کەسێکی گەورە پەروەردە بکات، بۆیە کردی بە لێپرسراوی ناوچەیەکی دیارییکراو لە نزیک شاری (حەلب)، کە پێی دەوترا (دیر سمعان)، (عمر)یش بەجوانی توانی سەرکردایەتی ئەو ناوچەیە بکات و ئەوپەڕی چاکە و دادپەروەریی بەکاربهێنێت، تاساڵی ٨٦ کۆچی وەک والی و سەرکردەی ئەو ناوچەیە مایەوە.

(عمر) ڕوخسارێکی ئەسمەری هەبوو، جەستەی کەمێک

لاواز بوو، ڕیشێکی زۆر جوانی هەبوو، ئیتر جوانییەکی بەرچاوی هەبوو، سەر بەبنەماڵەی ئومەویەکان بوو، لای هەموان خۆشەویست بوو، چونکە زۆر ڕاستگۆ و نەرم و نیان بوو، ئازاری کەسی نەدەدا، هەوڵی دەدا یارمەتی هەموان بدات.

دوای ئەوەی (عبدالملك)ی مامی کۆچی دوایی کرد ئەوەبوو (ولید) کە ئامۆزای (عمر) بوو، بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان، (ولید)یش خۆشەویستی زۆری هەبوو بۆ (عمر)ی ئامۆزای، نەک بەس لەبەر ئەوەی ئامۆزای بوو، بەڵکو لە بەر ئەوەش، کە کەسێکی زانا بوو و زۆر بەڕێز و چاکەکار بوو، بۆیە (ولید) بڕیاری دا عومەر بکات بە لێپرسراوی شاری (مدینە) ی خۆشەویست، پاش ئەوەی (عمر) بوو بە والی و لێپرسراوی ئەو شارە توانی زۆر سەرکەوتوو بێت و هەموان لێی ڕازی بوون، خەلیفە (ولید) بڕیاریدا ناوچەی (الطائف)یش، بخاتە ژێر دەستی (عمر)ەوە.

(عمر) مەرجی دانابوو کە نابێت ستەم لە کەس بکات و بەدادپەروەری بجووڵێتەوە، هەروەها بڕوات بۆ حەجی ماڵی خوای گەورە و حەج بکات، عومەر خێرا لە (مدینە) بڕیاری دا کۆمەڵێک لە زانایان کۆ بکاتەوە تا لە هەموو شتێکدا ڕاوێژیان پێبکات، بۆیە ئەنجومەنی ڕاوێژی دامەزراند، کە تیایدا (١٠) زانا بەشدار بوون، ئیتر لە هەموو شتێکدا ڕاوێژی

پێیان دەکرد، بەوەش نەیدەهێشت هیچ شتێک پێچەوانەی شەریعەت بێت، هەم بەوە خوای گەورە ڕازی دەبێت و هەم بەندەکانیش بەو دادپەروەری و لێزانییەی ڕازی دەبوون، (عمر) تا ساڵی ۹۳ کۆچی وەک والی (مدینە)مایەوە و خزمەتێکی بێ وێنەی پێشکەش کرد.

(عمر) کاتێک ئەو (۱۰)زانایایەی بانگکرد، تا ئەو کارەیان پێبسپێرێت پێی وتن، من بۆ کارێک بانگم کردوون، کە لە سەری پاداشت وەردەگرن و پێکەوە لەسەر حەق یارمەتی یەکتر دەدەین، ئەمەوێت هەرچی بڕیارێک بدەم ڕای ئێوەی لەسەر بێت، ئەگەر بینیتان کەسێک ستەمی لێکرا یان کەسێکی ستەمکارتان بینی ئاگادارم بکەنەوە، ئەوانیش ڕازی بوون و نزای خێریان بۆ کرد لەسەر ئەو هەوڵە جوانەی.

(عمر) لەو ماوەیەدا مزگەوتی پێغەمبەری(صلی الله علیه وسلم) نوێ کردەوە و فراوانی کرد، دوای ئەوەی (ولید)ی خەلیفەی موسوڵمانان و ئامۆزای (عمر) مرد، لە شوێنیدا سولەیمانی برای بوو بە خەلیفە، کە ئەویش ئامۆزای (عمر) بوو، خەلیفەی نوێ بڕیاریدا لە بەر چاکی و زانایی و بەهێزی (عمر) و ڕازی بوونی خەڵک لێی (عمر) بکات بە وەزیری خۆی.

سولەیمان هێندە متمانەی هەبوو بەنیازی پاک و زانایی (عمر)، کە بوو بەخەلیفە (عمر)ی بانگ کرد و وتی: تۆ

دەزانیت من بووم بەخەلیفە و منیش زۆر شارەزانیم و زانستم کەمە، جا تۆ چیت پێباش بوو فەرمان بکە با وابێت و وا بکە، (عمر)یش هەموو شتەکانی ڕاست دەکردەوە و خەلیفەش ڕازی بوو بە بڕیارەکانی.

(عمر) هەمیشە دەیوت ئەگەر بۆ سەرخستنی ئایینی خوا و پاراستنی لەسەر ڕاستی و ڕێنەدان بە تێکدانی ئیسلام پێویست بکات هەر جارە و پارچەیەک گۆشت له لەشم بکەنەوە، تا هەموو لەشم پارچە پارچە بکەن ئامادەم وام لێبێت و هیچیش پێی دڵتەنگ نابم.

جارێک خەلیفە لەگەڵ(عمر)دا حەجیان دەکرد، خەلیفە بە (عمر)ی وت: سەیری ئەو هەموو خەڵکە بکە بەس خوا ئەزانێت ژمارەیان چەندە، (عمر) پێی وت: ئەوانە ئەمڕۆ لە ژێر دەستی تۆدان، بەڵام سبەی لە ڕۆژی دواییدا هەموویان لە تاو خۆیان دەبن بە نەیار و ناڕازین لێت، خەلیفە کە ئەوەی بیرکەوتەوە دەستی کرد بەگریان.

(عمر) زۆر جار بەخەلیفەی دەوت سەرم سوڕ دەمێنێت لە کەسێک، کە خوا بناسێت کەچی لە فەرمانی خوا دەربچێت، شەیتان بناسێت کەچی بە گوێی بکات، دونیا بناسێت کەچی پشتی پێببەستێت.

دوای ئەوەی خەلیفە (سلیمان) کۆچی دوایی کرد بڕیار درا

بەیعەت بدرێت بە (عمر بن عبدالعزیز)، هەرچەندە خۆی حەزی نەدەکرد بەرپرسیارێتی وەربگرێت، بەڵام خەڵکی بەیعەتیان پێدا، ئەویش پاش ئەوەی خەڵکی لە مزگەوت کۆبوونەوە وتارێکی پێشکەش کرد و باسی کرد، کە ئەو کارەی ئەو سەختە و تاقیکردنەوەیە بۆیە با کەسێکی تر هەڵبژێرن، بەڵام خەڵکی هەموو هاواریان کرد ئێمە تۆمان دەوێت تا خەلیفە بیت، بۆیە ئەویش دواجار ڕازی بوو، ئینجا خەڵکەکەی هاندا بۆ لە خواترسان و چاکەکردن و دوورگرتن لە خراپەکاری.

(عمر) ماندوو بوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کوڕێکی هەبوو ناوی (عبدالملك)بوو، کە چوویەوە ویستی کەمێک ڕابکشێت، خێرا (عبدالملك)ی کوڕی وتی: بابە گیان ئەوە چی دەکەیت؟

وتی: کوڕم تەواو ماندووم دەمەوێت کەمێک بحەسێمەوە.

کوڕەکەی وتی: دەتەوێت بخەویت پێش ئەوەی مافی ڕەوای خەڵک بگێڕیتەوە بۆیان و ئەو ستەمەی کراوە لای بەریت، خەڵکێکی زۆر چاوەڕێی تۆن تا سکاڵا بهێننە لای تۆ و تۆیش بچیت بە دوای مافیاندا.

(عمر) وتی: کوڕم دەی من دوێنێ شەو هیچ نەخەوتوم و سەرقاڵی تەرمی سولەیمانی خاڵت بوم، با کەمێک بنوم دواتر چووم بۆ نوێژی نیوەڕۆ گوێ دەگرم لە کێشەی خەڵک.

(عبدالملك)ی کوڕی وتی: جا دڵنیای تا نیوەڕۆ نامریت؟
(عمر) خێرا هەستا و (عبدالملك)ی کوڕی ماچ کرد و گوشی بە خۆیدا و وتی: سوپاس بۆ خوا، کە منداڵی وای پێبەخشیوم لە ئایینداریدا هاوکارمە.

(عمر) لە سەردەمی خیلافەتیدا زۆر دادپەروەر بوو و هەردەم دەچوو بەدەم کێشەی خەڵکەوە، نەیدەهێشت ستەمکاران بحەوێنەوە و مافی لێ دەسەندنەوە، پاڵپشتی هەژاران و ستەملێکراوان بوو، زانایانی کۆدەکردەوە و ڕاوێژی پێ دەکردن و داوای دەکرد هەر ستەمێکیان بینی پێی بڵێن و ئاگاداری بکەنەوە، تا هەمووان پێکەوە ستەمەکە نەهێڵن، هەموو خۆشیەکانی خۆی واز لێهێنابوو بۆ ئەوەی بتوانێت خۆشی ببەخشێت بە خەڵک و ئاشتی و ئارامی وڵات بگرێتەوە، لە سەردەمی ئەودا خەڵکانێکی زۆری بێباوەڕ موسوڵمان بوون.

ئیتر هێندە خەڵکی لە خۆشی و شادومانییدا بوون، کە جارێکیان زەکاتیان هێنا (عمر) فەرمانی کرد دابەش بکرێت بەسەر ئەو هەژارانەدا کە ماون.

ئەوانیش وتیان: ئەی سەرکردەی موسوڵمانان هیچ هەژار نەماوە، ئەوەی هەژار بوو هێندەی پێبەخشراوە، کە دەوڵەمەند بووە.
عومەر وتی: دەی بڕۆن بەو پارەیە ژن بهێنن بۆ گەنجان.

وتیان: ئەوەشمان کردووە.

وتی: دەی کێ قەرزدارە بەو پارەیە قەرزەکەی بدەنەوە.

وتیان ئەوەشمان کردووە و هێشتا پارە ماوەتەوە.

وتی: دەی سەیری ناموسوڵمانەکان بکەن، کامیان قەرزدار بوو قەرزەکەی بۆ بدەنەوە، ئەوەشیان کرد هەر پارە مایەوە.

وتی: دەی بەخشش بدەن بە زانایان، ئەوەشیان کرد هەر مایەوە، پاشان فەرمانی کردو وتی: بڕۆن دانەوێڵە بکڕن و بەسەر شاخەکاندا بڵاوی بکەنەوە تا باڵندەکانیش تێربن.

جارێک (عمر) زۆر حەزی لە سێو بوو، وتی: خۆزگە سێوێکم هەبوایە، کەسێک هەستا و سێوێکی هێنا.

عومەریش وتی: ئەو سێوە ببە بۆ فڵانە کەس و سەلامی ئێمەی پێبگەیەنە.

کابرا وتی: خۆ پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) دیاری وەردەگرت. عومەر وتی: ئەوە بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) دیاری بوو، بەڵام بۆ ئێمە ئەمڕۆ بەرتیلە، بۆیە نەیخوارد و خۆی پاراست لەو گومانە و ئەو حەزەی نەهێنایەدی.

ڕۆژانی هەینی ئیمامی (عمر) خۆی وتاری دەدا بۆ موسوڵمانان، بۆ نوێژەکانی تریش خۆی پێش نوێژی دەکرد، کۆتا وتاریشی لە مزگەوتی ئومەوی پێشکەش کرد، لەوتارەکەیدا وتی: ئێوە هەروا دروست نەکراون و هەرواش بەرەڵا

نەکراون، بەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، تا خوای گەورە چاک و خراپ جیا بکاتەوە، قوڕ بەسەر ئەوەی لە ڕەحمەتی خوا دەربچێت... ئەی بەندەکانی خوا، لە خوا بترسن پێش ئەوەی بمرن، من کە ئەمە دەڵێم وا دەزانم کەستان هێندەی من تاوانبار نییە، بەڵام تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خوای گەورە.

ئەوە کۆتا وتاری ئیمامی (عمر) بوو و دوای ئەوە نەخۆش کەوت تا ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێک لە ساڵی ١٠١ کۆچی لە (دمشق) وەفاتی کرد و تەرمەکەشی برایەوە بۆ یەکەم شوێنی دەسەڵاتی کە (دیر سمعان) بوو.

**پەند و وانە**

دەبێت هەمیشە حەز بە زانست و کاری چاکە بکەین، چونکە مرۆڤ بە زانست و کاری چاکە دەتوانێت خوای گەورە لە خۆی ڕازی بکات و سوودی زۆریش بگەیەنێت بە خەڵک، دەبینین خەلیفە (عمر بن عبدالعزیز)، لەبەر ئەوەی هەم زانستی زۆری پێبوو، هەم حەزی بەکاری چاکە دەکرد خۆشی و بەختەوەریەکی زۆری بەخشی بە موسوڵمانان.

منداڵی ژیر و خواناس هەمیشە هەوڵ دەدات هاریکاری باوک و دایکی بێت و چاکەیان بیربخاتەوە، ئەوە خۆشەویستی نییە لە پێناو حەسانەوەیاندا کاری چاکیان بیرنەخەیتەوە،

هەرچەندە خەلیفە (عمر) زۆر ماندوو بوو، بەڵام (عبدالملك)ی کوڕی، باوکی ڕاچڵەکاند و تێیگەیاند هەرچەندە ماندووە، بەڵام مادەم پۆستەکەی گەورەیە دەبێت بچێت بەدەم کاری خەڵکەوە نەوەک بمرێت و فریای کاری خەڵک نەکەوێت.

ڕاوێژکردن بەزانایان کارێکی زۆر گرنگە، پێویستە لە هەر شتێکدا پرس و ڕاوێژ بەزانایان بکەین، چونکە زانایان بەهۆی ئەو زانستەی پێیانە دەزانن باشترین و خراپترین شتەکان چین، بۆیە کاتێک رای ئەوان وەردەگرین چاکترین شت دەزانین و دەتوانین چاکترین کار جێبەجێ بکەین.

مردن لە بەردەم هەموومانداییە و هەموومان دەبێت بمرین، بۆیە دەبێت لە بیری نەکەین و خۆمان ئامادە بکەین بۆ دوای مردن، چونکە ژیانی دونیا کاتییە و شوێنی ئەوەیە چاکە کۆبکەینەوە بۆ ڕۆژی دوایی، تا بەهەشت ببێتە شوێنی هەمیشەییمان، بەڵام زۆر کەس هەن بەجۆرێک دەژین وا دەزانن هەرگیز نامرن تا ئەوەی کتوپڕ مەرگ ڕێیان پێدەگرێت و بێ هیچ چاکەیەک ئەم دونیایە جێدەهێڵن.

کەسانی گەورە و خواناس هەمیشە ئامادەن لە پێناو ئاینی خوادا ماڵ و سامان و گیانی خۆیان بەخت بکەن، وەک دەبینین ئیمامی (عمر) ئامادەبوو هەموو جەستەی پارچە پارچە بکەن بەس ئایینی خوا سەربکەوێت و لاری و تاوانەکان نەمێنن.

پێویستە خۆمان بپارێزین لە حەرام و لە هەموو شتێکدا

بەگوێی ئارەزووەکانمان نەکەین، نەک وەک کەسانێک بین هەرچییان حەز لێبوو بیکەن یان بیخۆن و گوێ نەدەن بەحەرام، بەڵکو هەرچییەک حەڵاڵ نەبێت با زۆریش حەزی پێبکەین دەبێت بەهیچ جۆرێک نزیکی نەکەوینەوە، وەک چۆن ئیمامی (عمر) کاتێک گومانی هەبوو لەوەی ئەو سێوە بۆ ئەو حەڵاڵ بێت نەیخوارد و ناردی بۆ کەسێکی تر.

**پرسیارەکان**

١- گرنگی شاری (مدینه) چیە؟
٢- عومەری کوڕی (عبدالعزیز) چی (عمر بن خطاب)؟ لە چیدا لە یەک دەچوون؟
٣- (عمر) لە کوێ لە دایکبووە؟
٤- ژیانی منداڵی (عمر) چۆن بوو؟
٥- باسی دەسەڵاتی (عمر) بکە لە (مدینه).
٦- پەیوەندی نێوان (عمر) و خەلیفە (عبدالملك) چۆن بوو؟
٧- (عمر) داوای کرد لە کاربەدەستان ئەو سامانەی لە زەکات وەرگیرابوو چی لێبکەن؟
٨- بەسەرهاتی (عمر) و کوڕەکەی باس بکە کاتێک چوویەوە بۆماڵەوە.
٩- (عمر) لە کۆتا وتاریدا چی وت بە موسوڵمانان؟
١٠- ئەم چیرۆکە باس بکە بۆ خۆشەویستترین کەسی خۆت.

# صلاح الدینی الایوبی

ئازیزانم، ئەم کەسایەتی و هەڵکەوتەی ئەمجارە باسی دەکەین زانایەک نییە، کە بە کتێب و نووسین خزمەتی کردبێت، مامۆستایەک نییە، کە بەوتاردان و وانە وتنەوە نەوەیەکی پێگەیاندبێت، بەڵکو سەرکردەیەکی موسڵمانی کوردە، کە بەتوانا و شمشێری دەستی و بیری وردی سیاسی توانی خزمەتی باڵا پێشکەش بەموسوڵمانان بکات، خزمەتێک، کە وایکرد لەگەڵ ناو هێنانی هەموان بیناسن، تەنانەت هێندە خزمەتەکەی گەورە بوو کەبووە مایەی ناساندنی کورد و هەرکات ناوی ئەو بێت خێرا ناوی کورد دێت، یان کاتێک کەسێکی کورد خۆی دەناسێنێت بەکەسێک لە نەتەوەیەکی تر خێرا ناوی ئەم سەرکردەیەی بۆ دێنێتەوە، ئەویش سەرکردەی ئیسلام (صلاح الدینی الایوبی)یە.

ئەم سەرکردە گەورەیەی ئیسلام کورد بووە، ناوی (یوسف)، لە بنەماڵەی ئەیووبییەکانە، ئەیووبییەکان بنەماڵەیەکی کوردی موسوڵمان بوون کە کەسایەتی و سەرکردەی زۆر گەورەیان تێدا دەرکەوت، ماوەیەکی زۆریش دەسەڵاتی بەشێکی زۆری جیهانی

ئیسلامییان بەدەستەوە بوو، وەک قەڵای ئاسنین بەریان دەگرت بەهێرشی دوژمنانی ئیسلام.

لە ناو ئەم بنەماڵەیەدا کوڕێکی جوان و زیتەڵ دەرکەوت، کە ناوی (یوسف) بوو، باوکی ناسرابوو بە(نجم الدین) و ناوی (ایوب) بوو، (یوسف) ساڵی **٥٣٢** کۆچیی لە دایکبووە، لەو کاتەدا جیهانی ئیسلامی بەدەست چەندین کێشەوە دەیناڵاند، لە لایەکەوە لە ناو وڵاتدا خراپەکاران هەبوون، کە دەیانویست موسوڵمانان لە ناوبەرن، لە لایەکی تریشەوە لە دەرەوەی موسوڵمانان ناموسوڵمانەکان هێرشیان دەهێنا، تا خاکی موسوڵمانان داگیر بکەن.

باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە، کە ناوی شادی بوو کەسایەتییەکی زۆر گەورە و بەهێز بوو، بۆیە سەرکردەی موسوڵمانە تورکەکان (سەلجووقیەکان) پاراستن و بەرپرسیارێتی قەڵایەکی دا بەدەست شادییەوە کە ئەویش قەلای (تکریت) بوو، (صلاح الدین) لەو قەڵایەدا لە دایکبووە.

مامی (صلاح الدین)ناوی (شێرکۆ) بوو ئەویش سەرکردمیەکی دیاری سەربازی و جەنگاوەرێکی ڕێگەی خوا بوو، کەسێکی زۆر بەهێز بوو.

بەڵام کاتێک (صلاح الدین) لە دایکبووە بڕیاردرا باوکی

(صلاح الدین) و مامیشی قەڵای (تکریت) جێبهێڵن.

پرسیار: بۆچی بڕیار درا ئەو دوو برایە قەڵاکە جێبهێڵن؟

وەڵام: چونکە پیاو خراپێک هەبوو ویستبووی دەستدرێژی بکاتە سەر ئافرەتێک، ئافرەتەکەش داوای کردبوو لە (شێرکۆ) فریای بکەوێت، ئەویش چوو بوو و پیاوەکەی کوشتبوو، بۆیە بڕیاردرا لە بەر ئەوەی کوشتویەتی قەڵاکە جێبهێڵن.

ئیتر ئەوانیش کۆچیان کرد و چوون بۆ (موصل)، سەرکردەی موسوڵمانان لە (موصل) ناوی (عمادالدین زەنگی) بوو، واتە بنەماڵەی ئەوان زەنگیەکان بوون کە ئەوانیش خزمەتێکی زۆر گەورەیان پێشکەش بەموسوڵمانان کرد، کاتێک زۆر بە بەهێزی بەرگرییان دەکرد لە خاکی موسوڵمانان و نەیاندەهێشت بێباوەڕان خاکی موسوڵمانان داگیر بکەن.

کاتی خۆی (عمادالدین) کە لە جەنگێکدا شکستی خواردبوو، باوکی (صلاح الدین) پەنای دابوو هەروەها یارمەتی دابوو و خزمەتی کردبوو و دواتریش ڕزگاری کردبوو، بۆیە کاتێک باوکی (صلاح الدین) و خێزانەکەی چوون بۆ (موصل)، (عمادالدین) ئەو چاکەیەی لە بەرچاو بوو، ڕێزی زۆری گرتن و زەوی زۆری پێدان.

دواتر (عمادالدین) شارێکی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی

بەنـاوی (بعلبـک)، خێـرا بـاوکی (صـلاح الـدین)ی کـرد بە لێپرسراوی ئەو شارە، ئیتر (صلاح الدین) تەمەنی منداڵی خۆی لەوێ بەسـەر دەبـرد، لەوێ بـاوکی هەوڵیـدا (صـلاح الـدین) پێبگەیەنێـت، بـۆیە لە لایەکەوە دەینـارد بـۆ لای مامۆسـتا و زاناکـان تـا زانسـتە ئیسـلامیەکان فێـر ببێـت، لە لایەکـی تـرەوە هونەری جەنگـی و سەربازی فێر دەکرد، تا وەک موجاهیدێکی ڕێگەی خوا بتوانێت خزمەت بەئیسلام بکات، (صلاح الدین)یش هەوڵـی خۆیـدا، تـا بەتەواوەتـی هەڵکەوت و بـوو بەسەرکردەیەکی بەهێز.

(صلاح الدین) تەمەنی نزیکەی بیست و حەوت ساڵ بـوو کە وەک نێـردراوی (عمادالـدین) لەگەڵ (شـێرکۆ)ی مامیـدا بەسوپایەکەوە چوو بەرەو (مصر).

پرسیار: بۆچی چوون بۆ (مصر)؟

وەڵام: چـونکە سـەرکردەی دەوڵەتـی شـیعەکان داوای لە (عمادالدین) کرد یـارمەتی بدات دژ بەسـەرکردەیەکی خۆیـان لە بەرانبەردا هەندێک لە خـاکی (مصـر)ی دەداتە دەست، ئەویـش ڕازی بـوو، پاشـان ئەوەی کـرد بۆئەوەی (مصـر) بگەڕێنێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی سوننەکان.

(صـلاح الـدین) لەو سـوپایەدا ڕۆڵێکـی بەرچـاو و گەورەی

بینی، دوای سێ ساڵی تر جارێکی تر (صلاح الدین)چوویەوە بۆ (مصــــر)، بــۆ یارمەتییــدانی ســەرکردەی شــیعەکان دژ بە سەرکردەیەکی تری شیعە، کە خاکی موسوڵمانانی دەفرۆشت بە ناموسوڵمانەکان، ئەو سەرکردەیەش ناوی (شاور) بوو، (صلاح الدین)توانی ئەو سەرکردە ناپاکە بکوژێت.

دوای ئەم کــاره شــێرکۆی مــامی کــرا بە وەزیــری فاتیمیەکان(شیعەکانی ناو (مصر)) بەڵام هێندەی نەبرد شێرکۆ لابــراو لە شــوێنیدا (صـــلاح الــدین)دانرا، بەرەبەرە (صـــلاح الدین)هەوڵیدا بێئەوەی خوێن برژێت دەوڵەتی شیعەکان نەهێڵێت و لە شوێنیدا دەوڵەتی سوننی دابمەزرێنێت چونکە زۆربەی خەڵکی (مصر) و بەڵکو موسوڵمانانی جیهانیش سوننە مەزهەب بوون، تـوانی لە مـاوەیەکی کەمـدا ئەو دەوڵەتە نەهێڵێـت و لە شـوێنیدا دەوڵەتی ئەیوبی دابمەزرێنێت.

ئیتـر لێـرە بەدواوە (صـلاح الـدین)هەموو هەوڵـی بـۆئەوە بـوو هێرشی ناموسوڵمانە خاچ پەرستەکان بۆ داگیرکردنی خـاکی موسوڵمانان رابگرێت.

پرسیار: خاچ پەرستەکان کێ بوون؟

وەڵام: خــاچ پەرســتەکان ئەو ســوپا مەســیحییە بــوون، کە دەهــاتن بــۆ داگیرکردنــی خــاکی موســوڵمانان، بەڵام لە لایەن

چەند سەرکردەیەکی موسوڵمانانەوە لە ناوبران، وەک سەرکردە (نورالدین)، (عمادالدین)، (صلاح الدین) و (بیبرس) و کەسانی تر، لەو مەیدانەشدا (صلاح الدینی الایوبی) ڕۆڵی زۆر بەرچاوی بینی و توانی (قودس) لە دەستی ئەو خاچ پەرستانە وەربگرێتەوە و موسوڵمانان دڵخۆش بکات و ببێت بەشانازیەکی گەورەش بۆ گەلەکەی خۆی، ئەمەش لە ساڵی (٥٨٣) کۆچییدا بوو، ئەوکات (صلاح الدین)تەمەنی ٥١ ساڵ بوو، کاتێک جەنگێکی سەخت ڕوویدا کە ناسراوە بە جەنگی (حطین)، تیایدا پاش جەنگێکی قورس سوپای موسوڵمانان بەسەرکردایەتی (صلاح الدین)سەرکەوت و (قودس)ی ڕزگارکرد.

(صلاح الدین)کە (قودس)ی ڕزگارکرد رێگەی نەدا کوشت و بڕی ناموسوڵمانەکان بکرێت، بەڵکو رێزی گرتن و گیانی پاراستن و سامانی نەبردن، سەربەستی کردن ئایا دەچن بۆ وڵاتی سوپا مەسیحییەکان یان لە ناو موسوڵماناندا بمێننەوە، چونکە ئەوە سیفەتی موسوڵمانە، کە حەز ناکات بە ناهەق خوێن بڕژێت و رێزی هەموو کەس دەگرێت تەنانەت ئەوانەش کەدژی بوون، بۆیە ئەو ڕێز و گەورەییەی (صلاح الدین)وای کرد سەرکردە ناموسوڵمانەکان و خەڵکی ناموسوڵمانی تریش تەواو پێی سەرسامبن و بەرێزەوە ناوی ببەن.

هەروەها (صلاح الدین)هەموو پەرستگاکانی مەسیحییەکانی پاراست و ڕێگەی نەدا سوپای موسوڵمانان ئەو پەرستگایانە بڕووخێنن، هەرچەندە موسوڵمانەکان حەزیان دەکرد بیڕووخێنن، چونکە پێشتر ئەوان مزگەوتی موسوڵمانانیان دەڕووخاند و ژن و منداڵ و گەورە و بچووکی موسوڵمانانیان سەردەبڕی، بەڵام (صلاح الدین) تێیگەیاندن، کە ئەوان نابێت وا بکەن چونکە موسوڵمان بە خراپە وەڵامی خراپە ناداتەوە.

(صلاح الدین) تەواو حەزی بەجیهاد دەکرد و هەمیشە حەزی دەکرد لە ڕێگەی خوادا بجەنگێت و خاکی موسوڵمانان ئازاد بکات و ئایینی ئیسلام بگەیەنێت بەو شوێنانەش، کە پێیان نەگەیشتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر حەزی دەکرد تێکەڵی زانایان بێت و داوای دەکرد زانایان کتێبی بۆ بنووسن، تا بیخوێنێتەوە بۆئەوەی نەکەوێتە هەڵەوە، تەنانەت هەرکەس کتێبێکی بەهێزی بۆ بنووسیایە لە خۆی نزیکی دەکردەوە.

ئەم سەرکردە خۆشەویستە چاکەکارە بەوجۆرە بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی ئیسلام و موسوڵماناندا و لای موسوڵمانان و هاوڵاتیانی وڵاتەکەشی زۆر ئازیز و خۆشەویست بوو، زانایان زۆر ڕێزیان دەگرت و نزای خێریان بۆ دەکرد، بەو جۆرە ژیا تا ڕۆژی وەفاتی هات و لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا و لە ساڵی ٥٩٨

کۆچییدا کۆچی دوایی کرد، پاش نوێژ کردن لەسەرتەرمەکەی لە (دمشق) بە خاک سپێردرا، تا ئێستاش گۆڕەکەی زانراوە و لە (دمشق) ماوەتەوە.

**پەندو وانە**

موسوڵمان دەبێت وەفای هەبێت بەرانبەر بەو کەسانەی، کە چاکەیان هەبووە لەگەڵیدا، چونکە وەفاداری سیفەتی پێغەمبەران بووە، دەبینین چۆن (عمادالدین) وەفای هەبووە بەرانبەر بە باوکی (صلاح الدین) لە بەرئەوەی لە ڕابردوودا چاکەیەکی بەرانبەر ئەنجام داوە.

جیهادکردن و هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی خاکی موسوڵمانان لای خوای گەورە زۆر وەرگیراو و کاری جوانە و خوای گەورە پاداشتی زۆر گەورەی داناوە بۆ ئەو کەسانە، (صلاح الدینی الایوبی)یش نموونەیەکی باڵابووە لەو بوارەدا، کە توانی (قودس)ی خۆشەویست بگەڕێنێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان.

دەبێت موسوڵمان لەبەر ستەمی کەسانی خراپ نەکەوێتە ستەم کردن بەڵکو موسوڵمان هیچ کات بەخراپە وەڵامی خراپە ناداتەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، لە (مكة) چەند

ستەمی لێکرا، کەچی کاتێک (مکة)ی ڕزگارکرد لێیان خۆش بوو و تۆڵەی نەکردەوە لەوانەی کە ستەمیان لێکردبوو، (صلاح الدین)یش شوێن سوننەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کەوت و کاتێک (قودس)ی ڕزگارکرد ستەمی لە ناموسڵمانەکان نەکرد.

دەبێت ئێمە هەم وەک موسوڵمان و هەم وەک کورد شانازی بکەین بە (صلاح الدین)ەوە کە سەرکردەیەکی وابووە دوژمنەکانیشی بەسەر سامی و ڕێزەوە باسیان کردووە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە موسوڵمانی کورد خزمەتی پێشکەش کردووە و ئیسلام مایەی خێر بووە بۆ کورد و کوردیش بە جوانی ئیسلامی وەرگرتووە.

## پرسیارەکان

١- (صلاح الدین)ناوی چی بوو؟ لە کوێ و لە ساڵی چەند لە دایکبووە؟
٢- بۆچی ماڵی (صلاح الدین)کۆچیان کرد بۆ (موصل)؟
٣- (صلاح الدین)، کە چوو بۆ (مصر) چی کرد؟
٤- جەنگی (حطین) چی بوو؟
٥- باسی هەڵوێستی (صلاح الدین) بکە، کاتێک (قودس)ی ڕزگارکرد.
٦- ئایا لە دڵەوە (صلاح الدین)نت خۆش دەوێت؟
٧- ژیانی ئەم سەرکردەیە باس بکە بۆ یەکێک لە هاوڕێ ئازیزەکانت، دواتر پرسیاری لێبکە بزانە چی پەند و ئامۆژگاریەکی لێوە فێر دەبێت.

## ئیمامی نووی

ئەم جارە ئەو کەسەی باسی دەکەین زانایەکی دیار و گەورەی موسوڵمانانە، کە موسوڵمانان، تا ئەمڕۆش سەرقاڵن بەخوێندنەوەی نووسینەکانی، ئەم کەسە خوێندکاری ئیمامی (شافعی) بووە، بۆیە کوردستانی ئێمەش، کە سەر بەمەزهەبی ئیمامی (شافعی)ە زۆر گرنگی دەدەن بەنووسینەکانی، ئەویش ئیمامی (نووي)یە.

بەڵێ، وڵاتی (شام)، کە (سوریا) بەشێکە لەو وڵاتە، لانە و مەڵبەندی پێغەمبەران بووە، دوای ئەوەش سەدان زانای گەورەی تیایدا دەرکەوتووە، ئەو زانایانە بوونەتە هۆکاری ڕووناککردنەوەی کۆمەڵگە و ڕێپیشاندانیان بەرەو ڕاستیی، یەکێک لەو کەسانەش ئیمامی(نووي) بوو، کە توانی ببێتە ڕووناکیەکی گەورە بۆ کۆمەڵگە.

(نووي) لە بنەڕەتدا ناوی (یەحیا) بوو، باوکیشی ناوی (شەرەف) بوو، بەڵام بەهۆی گوندەکەیەوە هەر بە (نووي) ناسرابوو، لە ساڵی ٦٣١ کۆچیدا لە دایکبووە.

ئەم زانا گەورەیەی ئیسلام لە ناوچەی (حوران) لە (سوریا) لە دایکبووە، ئەویش لە گوندێک، کە ناسرابوو بە (نوا)، دایک و باوکێکی باوەڕداری هەبوو، کە زۆر خواناس بوون، هەمیشە هەوڵیاندەدا کوڕەکەیان لەسەر ئیمان و خواناسی پەروەردە بکەن.

تەمەنی (نووي) گەیشتە ١٠ ساڵ، کە ئیتر بە تەواوەتی خووی دایە زانست و کەوتە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و خوێندنی زانستە ئیسلامیەکان، ئیتر کاتێک منداڵان یارییان دەکرد ئەو نەدەچوو بۆ یاری کردن، بەڵکو قورئانی پیرۆزی دەخوێند و ئەوەی لەبەری کردبوو دووبارە دەیوتەوە، بۆیە مامۆستایەکی شارەزای ناوچەکە، کە بینی ئەم منداڵە وادەکات خێرا چوو بۆ لای باوکی (نووي) و داوای لێکرد منداڵەکەی سەرقاڵ نەکات بەهیچ شتێکەوە و هەموو کاتی منداڵەکەی بۆ وەرگرتنی زانست بێت، باوکیشی قسەکەی ئەو مامۆستایەی وەرگرت و هەوڵیدا منداڵەکەی وا لێبکات هەموو کاتی خۆی بۆ وەرگرتنی زانست تەرخان بکات، (نووي)یش خۆی زۆر حەزی لە زانست بوو، بۆیە بەخۆشحاڵیەوە پێشنیازەکەی وەرگرت.

ئەوەبوو لە نزیکەی تەمەنی نۆزدە ساڵیدا بوو، کە (نووي) لەگەڵ باوکیدا پێکەوە هاتن بۆ (دمشق)، تا خۆی سەرقاڵ بکات بە زانستەوە، ئیتر لە (دمشق) لە پاڵ مزگەوتی ئومەوی نیشتەجێ بوو و خۆی سەرقاڵ کرد بە خوێندن و لەبەرکردنی

قورئانی پیرۆز و زانستەکانی تر و تەواوی توانای خۆی خستەگەڕ بۆ ئەو بوارە.

لەو شوێنەدا زۆر بەهەژاری دەژیا و لەبری ئەوەی کەمێک بیری لای خۆشی ژیانیش بێت هەموو کاتی هەر بە خوێندنەوە بەسەربرد.

پاش دوو ساڵ لە سەرقاڵی بە زانستەوە باوکی بڕیاریدا بچێت بۆ حەجی ماڵی خوا، بڕیاریدا (نووي) کوڕیشی ببات لەگەڵ خۆیدا، ئەوەبوو کوڕ و باوک پێکەوە چوون بۆ حەجی ماڵی خوا، لە سەرەتای ڕۆیشتنەکەیانەوە تووشی تایەکی سەخت بوو و تا ڕۆژی عەرەفە ئەو تایەی مابوو، بەڵام دواتر بەسەلامەتی گەڕانەوە بۆ (سوریا).

دووبارە (نووي) لە (دمشق)دا کەوتەوە زانست خوازی، ئیتر زۆربەی کتێبەکانی بە لەبەرکردن لەبەردەکرد، نەک هەر ئەوەی تەنیا بەخوێندنەوەیان وازبهێنێت، ئیتر هێندە زیرەک و شارەزا بوو، تا مامۆستاکەی ئەرکی ئەوەی پێسپارد، وانە بڵێتەوە بە خوێندکارانی خوێندنگەکەی، ئەویش بەجوانی وانەی پێدەوتنەوە.

ئیتر بەرە بەرە لەگەڵ وەرگرتنی زانستدا (نووي) وانەشی دەوتەوە، وای لێهات زۆربەی هەرە زۆری کاتی خۆی تایبەت کردبوو بەو بوارەوە، زۆربەی ڕۆژەکان نزیکەی دوانزە وانەی هەبوو، ئەوەش ماندووبونێکی زۆری دەویست، چونکە وانەکانیشی لە بواری جیاجیادا بوون.

ئینجا کە گەیشتە ساڵی ٦٦٠ کۆچی ئیتر (نووي) زانا و مامۆستا بڕیاریدا دەست بکات بە نووسینیش، چونکە دەیویست ئەو زانستەی پێیەتی بیگەیەنێت بەوانەش، کە ئەو نایانبینێت، چ ئەوانەی لە ناوچەکانی تر بوون، یان ئەوانەی، کە دوای مردنی دێنە دونیا و دەژین، وەک چۆن دەبینین ئەمڕۆ ئێمە کتێبەکانی دەخوێنینەوە.

ئەو کات (نووي) زاناو مامۆستا تەمەنی نزیکەی ٣٠ ساڵ بوو، واتە هێشتا لەوپەڕی گەنجیدا بوو کەچی کەسانی زۆر لە خۆی بە تەمەنتر زانستیان لێوەردەگرت و وەک خوێندکار لە بەردەمیدا دادەنیشتن، تا زانست فێربن.

ئەم ئیمامە لەبری ئەوەی چاو ببڕێتە خۆشییەکانی دونیا و خوو بداتە ئارەزووەکانی، کاتەکانی تەرخان کرد بۆ زانستی شەرعی، خۆ ئەو دەیزانی، کە گوناهە نییە چێژ لە خۆشییەکانی تری دونیا وەربگریت، کە خوای گەورە حەڵاڵی کردوون، بەڵام (نووي) هەموو خۆشییەکی لە خواپەرستی و زانست وەرگرتن و زانست بەخشیندا دەبینییەوە.

(نووي) هەرچەندە خۆی حەزی بەماڵ و سامانی دونیا نەبوو، بەڵام هەوڵیدەدا مافی خەڵک نەفەوتێت و مافە خوراوەکان بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەوەبوو، کاتێک سوڵتانی موسوڵمانان ویستی هەندێک پارەی زیادە لەسەربوونی زەوی و زار لە خەڵک وەربگرێت، خێرا خەڵکی چوون بۆ لای ئیمامی

(نووي)، تا کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکات، ئەویش نامەیەکی نووسی بۆ سوڵتان و بەتوندی ڕێگری کرد لەوەی شتی وا بکات و تێیگەیاند، کە ئەوە حەرامە و نابێت بیکات، بەڵام سوڵتان تووڕە بوو و داوای کرد موچەکەی (نووي) ببڕن، کەچی خەڵکەکەی دەوری وتیان ئەی سوڵتان ئەو هیچ مووچەی نییە و لە ڕێی خوادا ئەو هەموو خزمەتەدەکات، دواتر ئیمامی (نووي)، کە زانی سوڵتان گوێی لێنەگرتووە خۆی چوو بۆ لای سوڵتان و قسەی لەگەڵ کرد، ئەوەبوو دواجار سوڵتان ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوە و بەهۆی هەوڵەکانی (نووي)یەوە، خوای گەورە باری سەرشانی خەڵکەکەی ئاسان کرد.

ئیمامی (نووي) لە کتێبخانەی گشتی ئەوقافی حکومەت کتێبی هێنابوو، دەیخوێندنەوە و سوودی وەردەگرت لەو کتێبانە، چونکە هەر کەس هەرچەندە زانا و شارەزا بێت هەر دەبێت بەردەوام زانیاری بخوێنێتەوە و واز نەهێنێت لە وەرگرتنی زانست.

دوای ماوەیەک (نووي) بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی و لەوێ ئەو بەشەی ژیانی بەسەربەرێت کەماوەتی، بۆیە چوو چی کتێبی کتێبخانەی ئەوقافی لاهەبوو هەموویانی بردەوە، دواتریش چوو بۆ سەر گۆڕی مامۆستاکانی، تا مردن و ژیانی ناو گۆڕی بیربکەوێتەوە، هەروەها نزای خێری کرد بۆیان، پاشان چوو بۆ سەردانی هاوڕێکانی و ماڵئاوایی کرد لێیان، ئینجا دوای ئەوە چوو بۆ سەردانی (قودس).

دوای هەموو ئەمانە ئینجا (نووي) گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی و لەوێ لای دایک و باوکی مایەوە، پاش ماوەیەک لەوێ نەخۆش کەوت، ئەوەبوو بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە، لە مانگی رەجەبی ساڵی ٦٧٦ کۆچیدا کۆچی دوایی کردو هەر لە گوندەکەی خۆیشی خرایە ناو گۆڕ.

کاتێک هەواڵی مردنی گەیشت بە موسڵمانان، هەموان دڵتەنگ بوون بۆی و دەگریان، کە چۆن زانایەکی وا گەورەیان لە دەست چوو، ئیتر سەرکردەو کەسە دیارەکان چوون، تا نوێژی لەسەربکەن.

بەڕاستی وایە ناخۆشترین ڕووداوی ناو کۆمەڵ لە دەستدان و مردنی زانایانی خواناسە، چونکە زانایان دەبنە چرای ڕووناکی بۆ کۆمەڵ و ڕێی ڕاستییان پیشان دەدەن، ئەوان فێرمان دەکەن چۆن بەرەو لای خوای گەورە بچین و خۆمان بپارێزین لە داوی شەیتان و دارودەستەکەی، بۆیە بە مردنی ئەو کەسانە زیانی گەورەمان بەردەکەوێت.

**پەندو وانە**

هەموو ئەو زانایانەی لە مێژووی ئیسلامییدا باس کراون، دەبینین بەشی زۆریان هەر لە منداڵییەوە حەزیان کردووە زانست وەربگرن و خوویان داوەتە ئەو بوارە و، چوونەتە خزمەت مامۆستا شارەزاکان، تا بوون بە زانای گەورە و هەڵکەوتوو، بۆیە زۆر

پێویستە ئێمەش هەر لە منداڵییەوە شان بدەینە بەر زانست وەرگرتن و هیوامان وابێت، کە ئێمەش ببینە زانا و خزمەتی گەورە پێشکەش بەگەل و برایانمان بکەین.

پێویستە زانایان لە پێش هەمواندا و پاشان هەموو کەسێکی دڵسۆزیش بیریان لای کێشە و نارەحەتی خەڵک بێت و کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکەن، لەوەشدا نەترسن و ئەگەر دەسەڵات هەڵە یان ستەمێکی هەبوو دەبێت بۆی ڕاست بکەنەوە و ئاگاداری بکەنەوە لەو هەڵە یان ستەمەی، کە دەیکات.

کەسی باوەڕدار هەمیشە دەبێت بە جوانی ئەمانەتی لای خۆی بپارێزێت و بە سەلامەتی و بەبێ کەموکورتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە نەگەڕاندنەوەی ئەمانەت، سیفەتی کەسی دوو ڕوو و ناپاکە، سەیر بکەن چۆن ئیمامی (نووي) ئەو کتێبانەی گێڕایەوە، کە لە لای بوون ئینجا ئەو شارەی بەجێهێشت.

دەبێت کاتێک سەردانی گۆڕستان دەکەین مردن و ژیانی دوای مردنمان بیر بکەوێتەوە، تا خۆمان لە هەڵە و تاوان بپارێزین وبزانین ڕۆژێک دێت خەڵکی تریش دێن بۆ سەر گۆڕی ئێمە، هەروەها دەبێت نزای خێر بکەین بۆ مردووەکان و سەلامیان لێ بکەین، چونکە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وای کردووە.

مردن لە ڕێگەی هەمووماندایە و هەموو کەس هەرچەندە گەورە زانایان دەوڵەمەند بێت، هەر دەمرێت، بۆیە چاکترین شت ئەوەیە مرۆڤ کاری چاکەی زۆر کۆبکاتەوە، تا کاتێک مرد و گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە چاکەی زۆری پێبێت، چونکە مردن کاتی نەزانراوە و لەوانەیە زۆر زوو بێتە ڕێمان، بۆیە کەسی ژیر ئەوەیە زوو چاکەی زۆر کۆبکاتەوە و قیامەتی خۆی ڕۆشن بکاتەوە.

**پرسیارەکان**

١- ئیمامی (نووي) لە کوێ دەژیا؟ ئەو وڵاتەی ئەو بەچی ناسراوە؟
٢- بۆچی ئیمامی (نووي) گوندەکەی خۆی جێهێشت و چوو بۆ (سوریا)؟
٣- باسی ئەو کێشەیەی خەڵک بکە کە ئیمامی (نووي) چارەسەری کرد.
٤- ئیمامی (نووي) پێش مردنی چەند کارێکی کرد، ئەو کارانە چی بوون؟
٥- ئایا تۆ ئیمامی (نووي)یت خۆش دەوێت؟ لە بەرچی؟
٦- ئایا تۆیش هەوڵتداوە زانست وەربگریت و لە داهاتوودا ببیت بەزانایەکی گەورە؟

# یوسفی کوڕی تاشفین

کاتێـک ئیسـلام هـات و بڵاوبـووەوە، موسـڵمانان ئیسـلامیان گەیانـد، بەنـاوچە جیاجیاکـانی جیهـان، ئیسـلام بەخـۆرهەڵات، خۆرئاوا، باکوور و باشووردا بڵاوبووەوە، یەکێک لەو ناوچانەش، کە ئیسـلامی پێگەیشـت، بریتـی بـوو لە بـاکووری کیشـوەری ئەفریقا، کە ئەمڕۆ دابەش بووە بۆ چەند وڵاتێکی ئیسلامی.

کاتێـک ئیسـلام گەیشـتە ئەو ناوچـانە خەڵکـی بە جـوانی ئیسلامیان وەرگرت و ئەوانیش خزمەتی گەورەیان پێشکەش کرد، چـونکە چەنـدین زانـا و سـەرکردەی گەورە لەو ناوچـانەدا دەرکەوتـن، بەمە دەبینـین لە هەمـوو نـاوچەیەکی جیهانـدا هەر نەتەوەیەک بەجۆرێـک خزمەتـی خـۆی پێشـکەش کـردووە، لەو ناوچەیەشـدا یەکێـک لەو سـەرکردە گەورانەی ئیسـلام، کە دەرکەوت (یوسف) بوو.

(یوسـف کـوڕی تاشـفین) بـوو، سـەر بە هـۆزی گەورەی

(صـــنهاجه) بـــوو، لە ســـاڵی ٤٠٠ کـــۆچی لە دایکبـــووە، هۆزەکەشـــی دەســـەڵاتداری نـــاوچەکە بـــوون، چەنـــدین زانـــا و ســـەرکردەی گەورە لە نـــاو ئەو هـــۆزەدا دەرکەوتـــن وەک ئیمـــام (عبداللەی کوڕی یاسین)، بەم جۆرە (یوسف) لە ناو هۆزێکی بەهێـز و بـاوەڕدار و ناسـراودا دەرکەوت و بەنـاز و ڕێـزەوە گەورە بوو.

هەر لە سـەرەتای ژیـانەوە (یوسـف)، لە نـاو بیابانـدا زانسـتی وەرگـــرت لە زانایـــانی گەورەی فەرموودەناســـەوە گـــوێیگرت لە فەرمـووده شـیرینەکانی پێغەمـبەری خوا (صـلی الـله علـیه وسلم)، لەسەر بنەمای زانست و ڕێنماییەکانی زانـای گەورەی هۆزەکەیـان ئیمـام (عبـداللەی کـوری یاسـین)، زانسـت و ڕێنماییەکـانی ئیسـلامی وەردەگـرت، دەچـووە خزمەت مامۆسـتایان و هەوڵیـدەدا زۆرترین کاتی خۆی تایبەت بکات بۆ زانست وەرگرتن.

(یوسف) تەنیا لە بواری زانستدا خۆی پێنەگەیاند، بەڵکو لە مەیـدانی سەربازیشـەوە خۆی پێگەیانـد و هونەرەکـانی جەنـگ و جیهـاد فێربـوو، چـونکە زۆر حەزی لە جیهـادی ڕێـی خـوا بـوو، هەروەها زانیاری پێویستی لەسەر سیاسـەت وەرگرت، لە ڕوانـگەی شـەریعەتی ئیسـلامەوە، تـا بتوانێـت خزمەتـی خـۆی پێشـکەش بکات.

(یوسف) بەشداری جیهاد و غەزای دەکرد و هاودەم بەو زانستەی پێی بوو، حەزی دەکرد خێر و گەورەیی جیهادی ڕێی خوایشی دەست بکەوێت، ئەوەبوو لە جەنگێکدا، کە ناسرابوو بەجەنگی (واحات) و لە ساڵی ٤٤٨ کۆچیدا ڕوویدا، تیایدا (یوسف) سەرکردایەتی سوپای موجاهیدانی کرد، لەو جەنگەدا (یوسف) توانی شاری (سەجلماسە) بگرێت، بۆیە سەرکردەی موسوڵمانان لەو ناوچەیە، بڕیاریدا (یوسف) بکات بە لێپرسراوی ئەو شارە، ئەویش زۆر بە جوانی ئەو شارەی بەڕێوەدەبرد و نموونەیەکی زۆر جوانی پێشکەش کرد.

دوای ماوەیەک (یوسف) دەستی کردەوە بەغەزا و ڕووی کردە چەند شوێن و شارێکی تر و دواجار خوای گەورە سەرکەوتنی پێبەخشی، پاشان ڕوویکردە شارێکی تری زۆر گرنگ و ناسراو بەناوی (أغمات) کە بنکەیەکی کۆن و گرنگی مەسیحیەت بوو، ئەو بنکەیە ببوو بە مۆڵگەی ئەو بەربەریانەی کە جوولەکە بوون، ئەوەبوو هێرشی بردە سەریان تا لە ساڵی ٤٤٩ کۆچییدا سوپای موسوڵمانان شارەکەی ئازاد کرد.

پرسیار: ئەو دەوڵەتەی (یوسف) تیایدا بوو بەچی ناسرابوو؟

وەڵام: ئەو دەوڵەتە ناسرابوو بە دەوڵەتی (مورابیتەکان) واتە

سەنگەرنشینان، واتە دەوڵەتی ئەوانەی لە ڕێی خوادا سەنگەر دەگرن.

مورابیتەکان پاشان بڕیاریاندا دەوڵەتی بێباوەڕی (برغواتە) لەناو ببەن، لە ناو سوپاکەشدا (یوسفی کوڕی تاشفین) بەشدار بوو، لەو جەنگەدا ئیمام (عبداللەی کوڕی یوسف) شەهید بوو، ئەمە بوو بە بنەڕەتێک تا (یوسف) شوێنی بگرێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتی مورابیتەکان.

ئەوەبوو (ابوبکر)ی سەرکردەی وڵات چوو بۆ دەرەوەی وڵات و (یوسف)ی لە شوێنی خۆی دانا، خەڵکیش زۆر ڕازی بوون لە دەسەڵاتی (یوسف) بۆیە کاتێک (ابوبکر)ی مامی گەڕایەوە بە بەرچاوی خەڵکەوە بڕیاریدا واز بهێنێت لە دەسەڵات بۆ (یوسف)ی برازای، ئامۆژگاری (یوسف)ی کرد و وتی: من ئەم کارەم دایە دەست تۆ و منیش لەوە بەرپرسم، دەی لە خوا بترسە بەرانبەر بە موسڵمانان و لەگەڵیان چاکبە، من و خۆیشت لە دۆزەخ ڕزگار بکە.

(یوسف)یش بەجوانی کاروباری بەڕێوە دەبرد و ئاژاوە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی وڵاتی نەهێشت و یەکڕیزی و بەهێزی بەخشی بەدەوڵەتەکەی، بەردەوامیش درێژەی دەدا بەجیهاد لە ڕێگەی خوا، هەندیک ناوچەشی بەئاشتی ئازاد کرد، وەک لە ساڵی ٤٥٥ دا بە ئاشتی چووە ناو شاری (فاس).

دواتر (یوسف) هەوڵیدا هەموو مەغریبی ئیسلامی یەک بخات و ناکۆکی نێوان موسوڵمانان نەهێڵێت، پاش هەوڵێکی زۆر و تووش بوون بەچەند جەنگێکی سەخت، دواجار توانی ئەو کارە بکات و وڵات بکات بە یەکپارچە و یەکرێز، ئەمەش نزیکەی ۳۰ ساڵ هەوڵ و ماندووبوونی ویست.

لە نزیک دەوڵەتەکەی (یوسف) لە (اندلوس) چەند دەوڵەتێکی بچووک و پارچە پارچەی ئیسلامی هەبوون، کە بە هۆی ناکۆکی نێوان خۆیان لە لایەن خاچ پەرستە مەسیحییەکانەوە هێرشیان دەکرایە سەر تاخاکی موسوڵمانان داگیر بکەن، پاش ئەوەی ئەوانە داوای یارمەتییان کرد لە (یوسف) ئەویش بەدەریادا پەڕیەوە و چوو بۆ یارمەتیدانی برا موسوڵمانەکانی.

سەرەتا (یوسف) نامەی نارد بۆسەرکردەی مەسیحییەکان و داوای لێکرد مسوڵمان بێت و واز بهێنێت لە هێرش بردنە سەر مسوڵمانان، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، بۆیە (یوسف) بڕیاریدا هێرش بباتە سەر ئەو ستەمکارە و مسوڵمانان لە دەستی ڕزگار بکات، ئەوکات تەمەنی (یوسف) زۆر بوو و پیریش ببوو، بەڵام بەڵێنی دابوو تا دوا هەناسە وازنەهێنێت لە جیهادی ڕێی خوا.

سەرکردەی مەسیحییەکان ویستی فێڵ بکات لە مسوڵمانان و

نامەی نارد، و وتی ڕۆژی هەینی هێرش ناکەین چونکە لای مسوڵمانان پیرۆزە و ئێمەش ڕێزیان دەگرین، ئەمەی کرد، تا مسوڵمانان ئاگایان  لە خۆیان نەبێت و هێرش بکەنە سەریان، بەڵام (یوسف) زۆر ژیر بوو هەرچەندە بەڵێنیدا هێرش نەبات، تامسوڵمان نەبێتە بەڵێن شکێن، بەڵام سوپای تەواو ئامادە کرد بۆ بەرگری، چونکە دەیزانی مەسیحییەکان ناپاکی دەنوێنن و بەڵێنەکە دەشکێنن.

ئەوەبوو مەسیحییەکان هێرشیان هێنا و پاش ڕوبەڕووبوونەوە لە شوێنێک، کە پێی دەوترا (زلاقە)، هەردوو سوپای موسوڵمانان و مەسیحیەکان بەرەنگاربوونەوە، جەنگێکی سەخت ڕوویدا، کە ناسراوە بە جەنگی (زلاقە)، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی هەینی بوو، دواجار پاش جەنگێکی سەخت مسوڵمانان سەرکەوتن و سەرکردەی مەسیحیەکانیش بریندار بوو.

(یوسف)ی سەرکردەی زانا و موجاهیدی وڵاتی موسوڵمانان پاش تەمەنێکی زۆر کە نزیکەی سەد ساڵ تەمەنی هەبوو لە مانگی موحەرەمی ساڵی ٥٠٠ ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

**پەندو وانە**

لە ناو ئیسلامدا هەموو نەتەوەکان جێیان ئەبێتەوە و قبووڵ کراون، ئیتر لە خواترسان بەپێی ڕەنگ و نەتەوە نییە، بەڵکو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیسلامدا لە خواترسان و پەیڕەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ کات ئیسلام جیاوازی ناکات لە نێوان کورد ،عەرەب، تورک، فارس، ئینگلیز و هەر نەتەوەیەکی تردا، بەڵکو جیاوازیەکە لەسەرئەوەیە کامیان کاری چاکە زیاتر بکات، هەر بۆیە هەرچەندە (یوسف) خەڵکی باکووری ئەفریقا بوو، توانی خزمەتێکی زۆر گەورە پێشکەش بکات بە موسڵمانان، تا ئێستاش هەموو موسڵمانانی جیهان شانازی پێوە بکەن.

دەبێت موسڵمان، تەنها یەک لایەنی ژیان نەگرێت، بەڵکو هەوڵ بدات هەموو لایەنەکانی ژیان وەربگرێت، تا بتوانێت لە هەموو بوارەکاندا سەرکەوتوو بێت، دەبینین (یوسف) هەم لە لایەنی زانستی و هەم لایەنی سەربازی و هەم لایەنی سیاسیشەوە خۆی پێگەیاند، دواتریش بەهەموو ئەو لایەن و بوارانەی توانی خزمەتی گەورە پێشکەش بکات بە موسوڵمانان.

جیهادی ڕێی خوا گەورەترین پاداشتی هەیە لای خوای گەورە، هەموو موسڵمانێک لە پێناو پاراستنی خاکی موسوڵمانان و سەرخستنی ئاینی خوادا دەبێت حەز بە جیهاد بکات، بەڵام

جیهاد هەر لە خۆوە ناکرێت و دەبێت سەرکردەی موسڵمانان بڕیاری جیهاد بدات ئەوکات موسڵمانانیش جیهاد دەکەن.

**پرسیارەکان**

١- (یوسف) لە چ ناوچەیەک دەژیا؟ ناوی باوکی چی بوو؟
٢- دیارترین مامۆستای (یوسف) کێ بوو، کە (یوسف) زۆر پێی سەرسام بوو؟
٣- (یوسف) چۆن دەسەڵاتی دەوڵەتی گرتەدەست لەبری مامی؟
٤- باسی حەزی (یوسف) بکە بۆ جیهادی ڕێی خوا.
٥- (یوسف) کەدەسەڵاتی گرتە دەست هەوڵی چی دا؟ ئایا سەرکەوتوو بوو لەوەدا؟
٦- (یوسف) بۆچی چوو بۆ ئەندەلوس؟
٧- جەنگی (زلاقە) چی بوو؟ بە کورتی باسی بکە.
٨- کاتێک (یوسف) مرد تەمەنی چەند ساڵ بوو؟ ئەی ساڵی مردنەکەی کەی بوو؟

# ابن تيمية

لە ناوچەیەکی کوردستانی ئازیز شارێک هەبوو پێی دەوترا (حران)، ئەم شارە کاتی زوو نشینگەی پێغەمبەری خوا (ابراهیم) پێغەمبەر بووە، بەڵام دواتر کەسانی بێباوەڕ تیایدا دەرکەوتن، کە پێیان دەوترا (صابیئیەکان)، ئەمانە لە بری خوای گەورە ئەستێرەیان دەپەرست.

کاتێک ئایینی ئیسلام هات، لە سەردەمی خەلیفەی موسڵمانان (عمر بن خطاب)دا لە لایەن موسوڵمانانەوە شاری (حران) ئازاد کرا، ئیتر ئاینی خوا گەیشتە ئەو شارە و ڕیشەی بتپەرستی تیایدا وشک بوو.

لە ناو ئەم شارە کوردیەدا بنەماڵەیەکی گەورە و خواناس دەرکەوت، کەزۆربەی هەرە زۆری کەسەکانی زانای گەورە و هەڵکەوتەی ناو موسوڵمانان بوون.

پرسیار ئەو بنەماڵەیە کێ بوون؟

وەڵام: ئەو بنەماڵەیە بنەماڵەی (تیمیە) بوو، ئەوانە دەیان

زانــای گەورەیــان پێشــکەش کــرد بەموســڵمانان و تــا ئەمــڕۆش موسڵمانان قەرزاری زانست و خزمەتی ئەوانن.

لەو شــارەدا و لە نــاو ئەو بنەمــاڵەدا زانــایەکی گەورە هەبــوو کە نــاوی (عبــدالحلیم) بــوو، ئەو زانــایە هەر لە منــداڵیەوە لەسەر دەســتی بــاوکی زانســتی وەرگــرت و پێگەیشــت و دواتــر کەوتە وانەوتنەوە و بڵاوکردنەوەی زانست و خزمەت کردن بە موسڵمانان، تــا کــاتی خــۆی هــات ژنێکــی هێنــا بەنــاوی (ســتونیعەم)، کە ئافرەتێکی زیرەک و زانا بووە.

خوای گەورە چەند منــداڵێکی بەخشی بەم ژن و پیــاوە زانــا و خواناسە، هەمــوو منداڵەکانیشیان کەســی دیــار و زانــا دەرچــوون، کە خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش کرد.

پرسیار: ناوی منداڵەکانی چی بوون؟ وەڵام: ناوی منــداڵەکانی بریتی بوون لە (عبدالرحمان، عبدالله، احمد). .

لە هەموویــان زیرەکتــر و زاناتریــان (احمــد) بــوو، کە لە بەر زۆر زیــرەکیەکەی بــوو بە کەســایەتی هەرە دیــاری بنەمــاڵەکەی، هەر لەبەر ئەوەش بەناوی بنەماڵەکەیەوە ناسراوە، بە (ابــن تیمیــة) ناوی دەبرێت.

ئیــبن تەیمیــە لە ســاڵی ٦٦١ کــۆچی لە شــاری (حەران) لە دایکبــــووە، لەوێ ســــەرەتای ژیــــانی دەســــتی پێکــــرد، هەر لە

منداڵییەوە دایک و باوکی گرنگییەکی زۆریان پێدا، تا زانستی زۆری پێببەخشن، بەڵام هێندەی نەبرد باری ژیانیان تێکچوو و ناچار بوون، شار و ناوچەی خۆیان جێبهێڵن، ئەوکات هێشتا تەمەنی (ابن تيمية) شەش ساڵ زیاتر نەبوو.

پرسیار:بۆچی ناچار بوون شار و ناوچەی خۆیان جێ بهێڵن؟

وەڵام: چونکە مەغۆلەکان، کە خەڵکێکی دڕندە و پیاوکوژ و خراپەکار بوون هێرشیان هێنا بۆ سەر شارەکەیان، بۆیە ئەو خێزانە ناچاربوون کۆچ بکەن بۆ وڵاتی (شام) بۆ شاری (دمشق)، بۆئەوەی دەستگیر نەکرێن بە شەو کۆچیان کرد، هەرچی کتێبیان هەبوو بەچەند عەرەبانەیەک لەگەڵ خۆیاندا بردیان، تا لەوێش لە زانست نەبڕێن.

کاتێک چوون بۆ شاری (دمشق) لەوێ باوکی لە مزگەوتدا وانەی دەوتەوە، (ابن تيمية)ش بەردەوام زانستی وەردەگرت و لە خزمەت چەندین زانا و مامۆستادا زانستی وەردەگرت، بەو جۆرە گەورە بوو، تا گەیشتە تەمەنی گەنجی.

ڕۆژێک (عبدالحليم) منداڵەکانی کۆکردەوە، تاوەکو بیانبات بۆ سەیران و گەڕان، بەڵام (ابن تيمية) داوای کرد لە باوکی ڕێی بدات نەچێت بۆ سەیرانەکە، باوکیشی ڕازی بوو، تا باوکی و براکانی چوون بۆ گەڕانەکەیان و هاتنەوە، (ابن

تیمیة) کتێبێکی گرنگ و گەورەی زانایەکی لە بەرکردبوو، کە باوکی هاتەوەو ئەوەی بینی تەواو سەرسام بوو بەتوانای کورەکەی، بۆیە ترسا خەڵکی زیانی پێبگەیەنن، بە (ابن تیمیة)ی کوری وت ڕۆڵە شیرینەکەم ئەمە بۆ کەس باس نەکەیت.

جارێک زانایەکی (حلب)ی هاتە (دمشق) و بیستبووی (ابن تیمیة) زیرەکە، بۆیە چوو بۆلای، تا تاقی بکاتەوە، کاتێک پرسیاری لێکرد و (ابن تیمیة) وەڵامی دایەوە، هێندە زیرەکانە و بە هێز وەڵامی دایەوە کە زاناکە تەواو پێی سەرسام بوو، زاناکە یەکسەر وتی: ئەگەر ئەم کورە بمێنێت لە داهاتوودا ڕۆڵی زۆر گەورەی دەبێت.

ئیتر هێندە زیرەک بوو، تا خێرا بوو بە زانایەکی دیار و لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا فەتوای دەدا لەسەر مەسەلەکان، فەتواکانیشی ڕاست بوون و زانایان رەخنەیان لێ نەدەگرت.

(ابن تیمیة) هیچ کات پارە و شتی لە خەڵک وەرنەدەگرت، چونکە هەر لە منداڵییەوە بەڵێنی دابوو بەخوای گەورە، کە لەسەر قورئان پاداشت وەرنەگرێت، بۆیە کاتێک قورئانی لەبەردەکرد و کەسێک بیویستایە خەڵاتی بکات وەری نەدەگرت، چونکە دەیوت من تەنیا لای خوا پاداشت وەردەگرم.

هیچ کات (ابن تیمیة)، ڕەخنەی نەدەگرت لە خواردن، بەڵکو بەهەر خواردنێکی حەڵاڵ ڕازی بوو و نارەزاییشی دەرنەدەبڕی.

لە ساڵی ٦٩٢ کۆچیدا واتە تەمەنی ٣١ ساڵی (ابن تیمیة) لەگەڵ کاروانێکدا چوو بۆ حەج، لە ڕێگەی سەفەریاندا ڕەشەبایەکی توند هەڵیکرد، کە ژمارەیەکی زۆری خەڵکەکە بەو هۆیەوە مردن، بەڵام (ابن تیمیة) و ژمارەیەکی تر لە خەڵکەکە رزگاریان بوو.

دوای ئەوەی باوکی کۆچی دوایی کرد، (ابن تیمیة) لە شوێنی باوکیدا لە مزگەوتدا وانەی دەوتەوە، هێندە زیرەک بوو، کە کاغەز و نووسینی لە بەردەستیدا نەبوو و هەموو شتەکانی لەبەر بوو، (ابن تیمیة) لە وتارەکانیدا زۆر گرنگی دەدا بە فەرمووده و لە ڕێبازی ڕاستی زانایانی پێشوو لای نەدەدا، دوای وتارەکەش گوێی دەگرت، لە پرسیاری خەڵک و وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە.

جارێک (ابن تیمیة) نەخۆش کەوت، کاتێک چوو بۆ لای پزیشک پزیشکەکە پێی وت: زۆر مەخوێنەرەوە و خۆت ماندوو مەکە.

لە وەڵامدا (ابن تیمیة) وتی: مەگەر ئێوە نالێن ئەگەر کەسێک حەزەکەی بێتەدی و خۆشی بێت، ئەوە بۆ تەندروستی

باشە، دەی من لە کاتی خوێندنەوە و زانستدا تەواو خۆشیمە و دەبێت باش بێت بۆم، بۆیە هۆکاری نەخۆشیەکەی من ئەوە نییە.

(ابن ئیمیة) لە بەرگریکردنی لە موسوڵمانان زۆر دلێر و نەترس بوو، کاتێک مەغۆلەکان هاتن و (شام)یان داگیر کرد، سەکردەکەیان ناوی (غازان) خان بوو، (ابن تیمیة) لەگەڵ ژمارەیەک زانای تر چوون بۆ لای، (ابن تیمیة) هێندە بە ڕەقی قسەی لەگەڵ کرد، کە هەموو زاناکانی تر ترسان، ئەو داوای کرد هەموو بەندکراوانی موسڵمانان و بەندکراوە ناموسڵمانەکانیش ئازاد بکرێن، ئەویش ڕازی بوو، پاشان هەموویانی ئازاد کرد، کاتێک گەڕانەوە زاناکانی تر وتیان: لەگەڵ ئەو ناچینەوە تووشی شتێکمان دەکات، کەچی ویستی خوا وابوو (ابن تیمیة) بەسەلامەت گەیشتەوە، کەچی ئەوان تووشی دەستەیەکی مەغۆلە ڕێگرەکان بوون، کە چییان پێبوو لێیان سەندن و ئازاری زۆریشیان دان.

کاتێک جارێکی تر مەغۆلەکان هاتن، تا خاکی (شام) داگیر بکەن (ابن تیمیة) هانی موسڵمانانیدا، تا ڕێیان پێنەدەن و وتاری بۆ دەدان، خۆیشی چوو بۆ لای سەرکردەی موسوڵمانان لە (مصر)، تا ڕازی بکات بێت بۆ هاوکارییان، ئەوەبوو بەسوپایەکەوە هاودەم بەسوڵتان گەڕایەوە و لە جەنگەکەدا خۆیشی بەشداری کرد و خوای گەورەش سەرکەوتنی بەخشی

بەموسوڵمانان، لە جەنگەکەشدا (ابن تیمیة) بەردەوام موسوڵمانانی هاندەدا، تا نەترسن و لە ڕێی خوادا بە گەرمی بجەنگن، چونکە خوا موسوڵمانان سەردەخات.

هەمیشە هەندێک کەس هەن، کە حەز ناکەن کەس لەوان گەورەتر بێت و خۆیان بەگەورە دەزانن، بۆیە ژمارەیەک لەو جۆرە کەسانە کەوتنە پیلان گێڕان، دژ بە (ابن تیمیة) و لای دەسەڵاتداران تۆمەتیان بۆ دروست دەکرد، تا ئەوەی بوونە هۆکاری بەندکردنی (ابن تیمیة)، سێ جار لە دادگای (دمشق) دادگایی کرا، بەڵام لە هیچ کامیاندا نەیانتوانی بیسەلمێنن، کە تاوانبارە و کاتێک زانییان بێتاوانە (ابن تیمیة)یان ئازاد کرد.

بەڵام جارێکی تر کەسانێکی ناو (مصر)، کە ڕقیان لە ناوبانگی (ابن تیمیة) بوو، تۆمەتیان بۆ دروست کرد و داوایان کرد لە (مصر) دادگایی بکرێت، خەلیفەش ئەو کات لە (مصر) بوو، ئەوان سەرکردەی وڵاتیان ڕازی کرد، تا داوا لە دەسەڵاتداری (شام) بکات (ابن تیمیة) بنێرێت بۆ (مصر)، هەرچەند ئەو ڕازی نەبوو، بەڵام خۆی بڕیاریدا بچێت و لەوێیش وەڵامی گومانەکان بداتەوە.

(ابن تیمیة) بەڕێکەوت بەرەو (مصر) و لە کۆتاییەکانی مانگی ڕەمەزاندا گەیشتە شاری (قاهرە)، کاتێک گەیشت ڕۆژی هەینی بوو، لە دوای نوێژی هەینی، لەگەڵ زانا و

کەسە دیارەکان مشتومڕی ئەنجامدا، بەڵام دواجار لەوێش بەندکراو دواتر گوازرایەوە بۆ بەندیخانەیەک، کە پێی دەوترا (جب)، بەڵکو دوو برایشی لەگەڵ خۆیدا بەند کران.

هێندە دژایەتی ئەو زانایە کرا، کە تەنانەت ئەوانەش شوێن نووسینەکانی بکەوتنایە ئەو کەسانەش بەند دەکران.

پرسیار: بۆچی دەسەڵاتداران وایان دەکرد لە کاتێکدا موسڵمانیش بوون؟

وەڵام: لەبەرئەوەی هەندێک کەس، کە حەزیان نەدەکرد (ابن تیمیة) وەک زانایەکی گەورە دەربکەوێت، وایان وتبوو بە دەسەڵاتداران، کە (ابن تیمیة) خەڵکی گومڕا دەکات، بەڵام (ابن تیمیة) ڕێی نەدەدا، کەس لە دژی دەسەڵاتدارانی موسوڵمانان هیچ بکەن، چونکە نەبوونی ئاژاوە و پاراستنی یەکڕیزی و ئاشتی ناو موسوڵمانانی لە لا گرنگتر بوو، تا ئازادبوونی خۆی.

(ابن تیمیة) پاش ماوەیەک ئازاد کراو ئەو ماوەیەی ئازاد کرا، لە مزگەوتەکاندا وانەی دەوتەوە و خەڵکی فێری زانست دەکرد، هاوکات نامەی دەنارد بۆ دایکی خۆشەویستی و بۆ خەڵکی (دمشق) و خۆشەویستی خۆی بۆیان دەردەبڕی.

هێندەی نەبرد جارێکی تر (ابن تیمیة) بەند کرا، ئەمجارەش یەکێک لە براکانی لەگەڵیدا بەندکرا، بەڵام هێندەی پێنەچوو،

کە سوڵتانی موسوڵمانان خۆی هات بۆ بەندیخانە بۆ لای، (ابن تیمیة) و ئازادی کرد.

پرسیار: ئەو سوڵتانە کێ بوو کە (ابن تیمیة)ی ئازاد کرد؟

وەڵام: ئەو سوڵتانە ناوی سوڵتان (ناصر) بوو، کە کاتێک توانی بێتە سەر دەسەڵات خێرا (ابن تیمیة)ی ئازاد کرد.

پاش حەوت ساڵ مانەوە لە (مصر)، دواجار (ابن تیمیة) لەگەڵ سوڵتانی موسوڵماناندا گەڕایەوە بۆ (شام)، لەوێ پێشوازیەکی گەرمی لێکراو خێرا ئەویش دەستی کردەوە بەوانە وتنەوە.

بەڵام هێندەی نەبرد جارێکی تر ئەو زانایە کەوتە بەر پیلانی ناحەزان و سەر لەنوێ تۆمەتیان بۆ دروست کرد و (ابن تیمیة)ی زانای بێتاوان جارێکی تر بەند کرا، ئیتر لەو بەندیخانەیەدا مایەوە، تا ئەوەی دواجار لەوێ نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد.

لە ماوەی ئەو بەند بوونەیدا (ابن تیمیة) هەشتا و یەک جار هەموو قورئانی پیرۆزی خوێندەوە و زیکر و پەرستشی زۆری دەکرد.

کاتێک کۆچی دوایی کرد، هەمووان بەمردنی دڵتەنگ بوون، تەنانەت ئەوانەش کە دژی بوون، شار تەواو قەرەباڵغی

دایگـرت و هەمـووان هـاتن بـۆ نـوێژکردن لەسـەر تەرمەکەی و مەراسیمی ئەسپەردەکردنەکەی، هێندە قەرەباڵغ بوو، کە بازاڕی شـار داخـرا، نـزیکەی پێـنج سـەد هەزار کەس نوێژیـان لە سـەر تەرمی (ابن تیمیة) کرد.

پاش خۆی (ابن تیمیة) نووسین و کتێبی زۆری جێهێشت بۆ موسڵمانان، کتێبەکانی نزیکەی سەد کتێب زیاتر دەبوون کە تا ئەمـڕۆش موسـوڵمانان دەیـانخوێننەوە و سـوود لە زانسـتەکەی وەردەگرن.

**پەند و وانە**

زۆر پێویستە حەز بکەین بەدوای زانستدا بگەڕێین و هەمیشە لەگەڵ کەسانی زیرەک و زانادا هەڵسوکەوت بکەین.

سوپاسـی خـوای گەورە بکەیـن، کە لە نـاڕەحەتی و سـتەم و هێرشـی دوژمنـان بمانپارێزێـت، نابێـت موسـوڵمان ئـاوات بە بەرەنگاربونەوەی دوژمن بخوازێت و داوا لە خوا بکـات سەلامەتی پێببەخشێت، چونکە ئاژاوە و جەنگ هۆکاری وێرانییە.

گەورەتـرین سامانی بەنـرخ و نەفەوتـا و بـریتییە لە زانسـت و دەبێت لە هەمـوو کاتێکـدا هەوڵی زانسـتخوازی بدەین، بەڕاستی کتێـب هـاوڕێیەکی خۆشەویسـت و دڵسـۆزە و دەبێـت بە جـوانی کتێبەکانمان بپارێزین.

جیهادکردن له ڕێی خوای گەورەدا فەزڵی زۆری هەیە و بەردەوام هاوەڵان و زانایانی ئیسلام، ئەگەر جیهاد کردنیان بەدی کردبێت تیایدا بەشدار بوون.

نابێت هەرگیز ڕەخنە بگرین لە خواردن و بەهەموو بەخششێکی خوا ڕازی بین، ئەگەر بەدڵمان نەبوو خواردنەکە نەخۆین و بێ گلەیی کردن بگەڕێینەوە دواوە.

هەمیشە پشت بە خوای گەورە ببەستین و دڵنیابین خوای گەورە ئاگای لە هەموو شتێکە و هەرچییەک خوا بیەوێت تەنیا ئەوە دەبێت.

دەبێت هەمیشە وریای ئاشتی و خۆشی موسوڵمانان بین و خۆمان بپارێزین لە فیتنە و ئاژاوەنانەوە، وەک چۆن (ابن تیمیة) هەرچەندە بەندیش کرابوو کەچی نەیدەهێشت بەهۆی ئەوەوە موسوڵمانان کێشە بکەوێتە نێوانیانەوە.

خوای گەورە پاڵپشتی موسڵمانانە و هەرکات موسڵمان ڕاستیەکی زانی و پێویست بوو، بیڵێت نابێت بترسێت و دەبێت بیڵێت، بەتایبەت وتنی ڕاستی لە بەردەم کەسی ستەمکاردا گەورەترین جیهادی ڕێی خوایە.

## پرسیارەکان

١- (ابن تیمیة) ناوی چی بوو؟لە کوێ لە دایکبووە؟
٢- بنەماڵەی (تەیمیە) بە چی ناسراون؟
٣- (ابن تیمیة) چۆن تەمەنی منداڵی بەسەر برد؟
٤- باسی گەشتی حەجی (ابن تیمیة) بکە.
٥- کاتێک مەغۆلەکان هاتن بۆچی (ابن تیمیة) چوو بۆ (مصر)؟
٦- بۆچی (ابن تیمیة) زوو زوو بەند دەکرا؟
٧- باسی مردنی (ابن تیمیة) بکە.
٨- دەتوانیت ژیانی ئەم زانایە باس بکەیت بۆ خوشک و براکانت یان بۆ هاوڕێکانت؟

# ابن قیم

یەکێکی تر لە زانا ناودار و گەورەکانی جیهانی ئیسلامی (ابن قیمی جوزی)یە، کە تا ئەمڕۆش نووسینەکانی لەبەردەستی موسڵماناندان و سوودیان لێدەبینرێت، بەڵکو یەکێکە لەو زانایانەی، تا ئەمڕۆش نووسینەکانی زۆر بایەخییان پێدەدرێت و وەردەگێردرێن بۆ زمانە جۆراوجۆرەکان، لەوانەش هەندێک کتێبی وەرگێردراون بۆ سەر زمانی پاراوی کوردی.

(ابن قیم) لە شاری (دمشق) لە دایکبووە، (دمشق) پایتەختی ئەمڕۆی (سوریا)یە، هەر لە زووەوە ئەو شارە مەڵبەند و لانەی زانایان و کەسە گەورەکان بووە، وەک بینیمان (ابن تیمیة)ش کە زانایەکی گەورەی ئیسلام بوو لە (دمشق) ژیا و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

پرسیار: (ابن قیم) ناوی چی بوو؟

وەڵام: (ابن قیم) ناوی (محمد) بووە و باوکیشی ناوی (قیم) بووە، ئەو بنەماڵەیە ناسرابوون بە(جوزی)، هەر بۆیە (محمد)ی

زاناش لەبری ئەوەی بە ناوی خۆیەوە ناو دەربکات زیاتر ناسراوە بە (ابن قیم جوزی) (قیم)ی باوکی یەکێک بووە لە زانا ناسراوەکانی ناو (دمشق) و لە خوێندنگەی (جوزی) لە (دمشق) سەرقاڵ بوو، بۆیە هەم خۆیشی و هەم نەوەکانیشی ناسران بە (جوزی)، لەبەر بوونی باوکیان لەو قوتابخانەیەدا.

(ابن قیم) لە ساڵی ٦٩١ کۆچی لە شاری (دمشق) لە دایکبووە، هەر لە سەرەتای ژیانییەوە لە ناو خاک و ناوچەی زانایاندا گەورە بوو.

(ابن قیم) کەسێکی زۆر لە خواترس و باوەڕدار بوو، ئەو هەمیشە سەرقاڵ بوو بە پەرستشی خوای گەورە و خۆی دەپاراست لە هەموو تاوانێک، هەوڵی دەدا خوای گەورە ڕازی بکات، چونکە دەیزانی ڕەزامەندی خوای گەورە لە هەموو شتێک گرنگترە، زۆربەی کاتی خۆی سەرقاڵ دەکرد بە زانستەوە و لە خزمەت مامۆستایاندا دەبوو، یان وانەی دەوتەوە یان خۆی سەرقاڵ دەکرد بە نووسینی کتێبەوە، تا موسوڵمانان لێی سوودمەند بن.

کاتێک نوێژی دەکرد حەزی دەکرد ماوەیەکی زۆری پێبچێت، ئیتر قورئانێکی زۆر زۆری دەخوێند و زۆر لە کڕنووش و سوجدەدا دەمایەوە، پاش نوێژەکەشی زۆر بەهێمنی و بەبێ

پەلەکردن دادەنیشت و زیکری خوای گەورەی دەکرد، بەتایبەت، کە نوێژی بەیانی دەکرد نەدەخەوتەوە، بەڵکو دادەنیشت یادی خوای دەکرد، تا تەواو دونیا ڕۆشن دەبوو و خۆر هەڵدەهات.

(ابن قیم) ماوەی ڕۆژانەی خۆی بە چەند کارێک دەبردە سەر. لەوانەش: خۆی سەرقاڵ دەکرد بەنوێژ و پەرستشەکانەوە و لەوەشدا نموونەیەکی باڵا بوو، هەروەها لە قوتابخانەی (جوزی) پێشەوایەتی دەکرد و وانەی دەوتەوە، هەروەها لە چەند شوێنێکی تری وەک (صدریە) و شوێنانی تر وانەی دەوتەوە، ماوەیەکی دانابوو تایبەت بەکێشەکانی خەڵک و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان تا بەپێی بڕیاری شەریعەت کێشەکانیان، بۆ ڕوون بکاتەوە، چارەسەری دروستیان بخاتە بەردەست، کاتێکی تایبەتیشی دانابوو بۆ نووسینی کتێب و بابەتی گرنگ بۆ موسڵمانان، ئیتر نووسینەکانی هێندە زۆرن، کە لە سەروو ٣٠ کتێبەوە دەبوون، کتێبەکانیشی هێندە بەهێزن، کە بۆ هەموو کاتێک دەبن، ئێستاش لە کوردستاندا هەندیک لە کتێبەکانی کراون بە کوردی و چاپ کراون.

پرسیار: ئایا پەیوەندی نێوان (ابن قیم) و (ابن تیمیە) چۆن بوو؟

وەڵام: (ابن قیم) خوێندکارێکی زۆر زیرەک و گوێڕایەڵی

(ابن تیمیه) بوو، بەڵکو لەسەر ئەوەی زۆر گوێی دەگرت لە (ابن تیمیه)، لەسەر ئەوە ئازار و ناڕەحەتی زۆری تووشبوو، چونکە کەسانێک هەبوون حەزیان نەدەکرد (ابن تیمیه) کەسی لە دەور بێت و پێیان خۆش نەبوو ئەو هێندە زیرەک بێت، بۆیە دژایەتی خۆیشی و خوێندکارەکانی ئەویشیان دەکرد، ئەوەبوو کاتێک ئیبن تەیمیە بەند کرا (ابن قیم)یش بەند کرا، بەڵام دوای ئەوەی (ابن تیمیه) مرد، ئیتر (ابن قیم)یان ئازاد کرد.

(ابن قیم) منداڵێکی زیرەکی هەبوو، کە ناوی (ابراهیم) بوو، ئەو منداڵەی لە لای (ابن قیم)ی باوکی وانەی دەخوێند و هەوڵیدەدا شوێن پێی باوکی هەڵبگرێت، هەموو خوێندکارەکانی (ابن قیم)بوون بە زانای گەورە و دیاری ناو موسڵمانان، وەک، ئیمامی ابن کثیر، ئیمامی ابن رجب، ئیمامی زەهبی و چەندینی تر، کە هەموویان خوێندکاری ئیمامی (ابن قیم)بوون.

جارێکیان شەوی پێنج شەممە بوو، دەنگی بانگی عیشا لە مزگەوتەوە بەرز دەبوویەوە، لەو کاتەدا (ابن قیم)ی زانای خواناس کۆچی دوایی کرد، ئەمەش لە ساڵی ٧٥١ کۆچیدا بوو، ئیتر تەرمەکەی مایەوە، تا موسوڵمانان هەموویان بتوانن نوێژی لەسەربکەن، ئەوەبوو بۆ بەیانییەکەی لە کاتی نوێژی نیوەڕۆدا، لە مزگەوتی ئومەوی نوێژی لەسەرکرا، دواتر

خەڵکەکە هێندە زۆر بوون کە دەیانویست نوێژی لەسەربکەن لە مزگەوتی (جەراح)یش نوێژیان لەسەرکرد، ئینجا بردیان بۆ گۆڕستان و بەدەم فرمێسک و گریانەوە، لە ناو قەرەباڵغیەکی زۆر و کەم وێنەدا تەرمی ئەو زانایەی ئیسلام خرایە ژێر خاک، خوای گەورە بەهەشتی بەرین بکاتە شوێنی و لە دۆزەخ بیپارێزێت و لە ڕۆژی دواییدا بەبینینی لە بەهەشتدا خۆشحاڵمان بکات.

**پەندو وانە**

هەمیشە پێویستە بگەڕێین بەدوای زانستدا و هەوڵ بدەین زانایانی دەوروبەرمان بکەین بەمامۆستای خۆمان و زانستیان لێوەربگرین، تا بتوانین شوێن پێی زانایان هەڵبگرین و ببینە مایەی خێرو سوود بۆ دەوروبەرمان.

پێویستە هەوڵ بدەین، کە گەورە بووین کتێبەکانی ئەم زانا گەورەیە بخوێنینەوە، هەروەها لە ئێستاشدا بەدایک و باوک یان مامۆستاکانمان بڵێین کتێبەکانی ئەو زانایە بخوێننەوە و بۆمان باسیان بکەن، تا سوود وەربگرین لە زانستی هەرچەندە ئەو مردووە ،بەڵام کتێبەکانی بەزیندوویی ماونەتەوە.

پێویستە ئێمەی موسوڵمان زۆر گرنگی بدەین بە یاد و زیکری

خوا و نوێژەکانمان بەجوانی بکەین و پەلە نەکەین لە نوێژەکانماندا، چونکە نوێژکردن قسەکردنە لەگەڵ خوای گەورە، هەروەها گرنگی زۆر زیاتر بدەین بەنوێژی بەیانی و یادکردنی خوا لە دوای ئەو نوێژە و ئەگەر بتوانین دوای ئەو نوێژە سەرقاڵی زیکر بین، تا ڕۆژ دەبێتەوە.

## پرسیارەکان

١- (ابن قیم)لە ساڵی چەندو لە کوێ لە دایکبووە؟
٢- شاری (دمشق) بەچی ناسراوە؟
٣- پەیوەندی نێوان (ابن قیم)و (ابن تیمیە) باس بکە.
٤- دەتوانیت ناوی هەندیک خوێندکاری (ابن قیم)بهێنیت؟
٥- بۆچی (ابن قیم)بەند کرا؟
٦- دەتوانیت باسی مردنی (ابن قیم)بکەیت؟
٧- جوانترین شت لە ژیانی ئەم زانایەدا بەلای تۆوە چیە؟

## محمدی فاتح

لە ناو ئیسلامدا هەموو نەتەوەکان جێیان ئەبێتەوە و قبووڵ کراون، ئیتر لە خواترسان بەپێی ڕەنگ و نەتەوە نییە، بەڵکو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیسلامدا لە خوا ترسان و پەیڕەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ کات ئیسلام جیاوازی ناکات لە نێوان کورد و عەرەب و تورک و فارس و ئینگلیز و هەر نەتەوەیەکی تردا، بەڵکو جیاوازیەکە لەسەرئەوەیە کامیان کاری چاکە زیاتر بکات، هەر بۆیە ئەو گەلانەی موسوڵمان بوون هەوڵیانداوە پێشبڕکێ بکەن لە کاری چاکە و خزمەتکردن بە پەیامی خوادا.

یەکێک لەو نەتەوانەش تورکەکان بوون، کە موسوڵمان بوون و توانیویانە بە درێژایی مێژوو خزمەتی گەورە پێشکەش بکەن بە موسوڵمانان، ئەگەرچی لەم دواییانەی مێژوودا کاتێک گوێڕایەڵی ڕێنماییەکانی پەیامی خوا نەبوون هەندێکیان ستەمی زۆریان کرد لە گەلی کوردی موسڵمان، بەڵام پێشتر تورکەکان

زۆر بــاوەڕدار بــوون و خزمەتــی گەورەیــان بە ئیســلام دەکــرد و هەموو هەوڵیان بۆ ئەوە بـوو ئیسلام بگەیەنن بەو شوێنانەی، کە ئیسلامیان پێنەگەیشتووە و دەوڵەتی ئیسلامی گەورە بکەن.

تورکەکــان، توانییــان دەوڵەتێـک دابمەزرێـنن کە ناویــان نــا دەوڵەتـی عوسـمانی، ئەوەش لە بەرئەوەی یەکەم کەس دایمەزرانـد ناوی (عثمان) بوو، لە نـاو ئەو دەوڵەتەدا چەندین سوڵتانی بەهێز هاتن، تـا ئەوەی سوڵتانێکیان هـات بە نـاوی (محمد)، کە توانی ڕۆڵێکی گەورە ببینێت و ببێت بە یەکێک لەو کەسانەی، کە گەورەترین خزمەتیان پێشکەش بە موسوڵمانان کرد، وەک چۆن (صـلاح الـدین)ی کـورد (قـودس)ی ڕزگـارکرد، (محمـد)ی تورکەکـانیش (قسـطنطنیە)ی پـایتەختی مەسـیحیەکانی ئـازاد کرد.

پێغەمـبەری خـوا (صـلی اللـه علـیه وسـلم)، هەر لە سـەردەمی خۆیدا هەواڵی دابوو بەهاتنی ئەم سەرکردەیە، کاتێک بەهاوەڵانی خۆی فەرموو بە دڵنیاییەوە(قسطنطنیە)ئازاد دەکرێت، بە ڕاستی ئەو ســـوپایەی ئـــازادی دەکـــات ســـوپایەکی زۆر باشـــە و سەرکردەکەشی سەرکردەیەکی زۆر باشە.

(محمـــد) لە ســـاڵی ٨٣٣ کـــۆچی لە شـــاری (ئـــدرنە) لە (ترکیا) لە دایکبووە، باوکی ناوی (مراد) بوو کە سوڵتانی ئەو

کاتی عوسمانییەکان بوو، دایکیشی ناوی (هوما) خاتوون بوو، ئیتر (محمد) هەر لە سەرەتای ژیانییەوە لە ناو کۆشک و دەسەڵاتدا لە دایکبووە، زۆر بەجوانی گەورە دەکرا و خزمەتی باشی دەکرا، باوکی مامۆستای تایبەتی بۆ دانابوو، تا هەر لە منداڵییەوە وانە فێر ببێت، یەکێک ە دیارترین مامۆستاکانیشی مامۆستایەکی زانای گەورەی کورد بوو، کە ناسرابوو بە (شێخی گۆرانی).

بۆئەوەی (محمد) فێری کاری بەڕێوەبردن بێت، مورادی باوکی بڕیاریدا (محمد) بنێرێت بۆناوچەی (ئەماسیا)، تا بەڕێوەبەردنی ئەوێی بداتە دەست، ئیتر بەوە فێری بەڕێوەبردن دەبێت، ئەو کات هێشتا تەمەنی (محمد) یانزە ساڵ بوو، ئەوەش نیشانەی گرینگی پێدانییەتی لە لایەن باوکییەوە و بەهێزی و زیرەکی (محمد)یشە.

(محمد) سەرەتا لەوێ زۆر گوێی نەدەگرت لە مامۆستاکانی، بۆیە باوکی بڕیاریدا مامۆستا و زانایەکی زۆر گەورەی بۆ بنێرێت، تا جوان پەروەردەی بکات، ئەوەبوو شێخ (احمدی گۆرانی) بۆنارد، کە زانایەکی گەورەی کورد بوو.

(شێخی گۆرانی) هێندە لە لایەن باوکی (محمد)ەوە مۆڵەتی پێدرابوو، کە ئەگەر (محمد) تەمبەڵی بنواندایە یان لارییەکی

هەبوایە (شێخی گۆرانی) بە دارێک لێیدەدا و تەمبێی دەکرد، تا دووبارەی نەکاتەوە، هەروەها هەر لە سەرەتاوە (شێخی گۆرانی) بەردەوام ئەوەی فێری (محمد) دەکرد، کە فەتح کردنی(قسطنطنیە)چەندە گرنگە و باسی فەرموودەی پێغەمبەری خوای بۆ دەکرد لەو بارەیەوە، تا لە ئاییندەدا، کە بوو بە سوڵتان هەوڵبدات ئەو کارە بکات، (محمد)یش بەجوانی ئەوەی وەرگرت و کردی بە ئامانجی خۆی ئەگەر بوو بەسوڵتان ئەو کارە بکات.

لە ماوەیەکی کەمدا (شێخی گۆرانی) هەموو قورئانی بە(محمد) خوێند، فێری وانەکانی شەریعەت و هەنگاوەکانی خواترسی کرد، (محمد)یش زۆر لە مامۆستاکەی دەترسا و شەرمی لێدەکرد، چونکە زانایەکی زۆر گەورە و بەرێز بوو، بەو جۆرە پەروەردەکردنی لەسەر بنەماکانی ئیسلام زۆر کاریگەری لەسەر(محمد) هەبوو، ئیتر (محمد) زۆر هەوڵیدەدا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، تایبەت بەفەتحی(قسطنطنیە)ئەو بگرێتەوە.

(سوڵتان مراد) کە بینی (محمد)ی کوڕی چاک پەروەردە بووە، بڕیاریدا واز لە دەسەڵات بهێنێت بۆ (محمد)ی کوڕی و خۆی بچێتە ناوچەیەکی دوور، تا دوور لە سەختی دەسەڵات بژی، ئەوکات تەمەنی (محمد) (١٤) ساڵ بوو، بەڵام هێندە لەوێ نەبوو کەبیستی (مجری)ەکان، کە خەڵکێک بوون٠

هەڵگەڕاونەتەوە لە دەسەڵات، نامەی نووسی بۆ باوکی و داوای لێکرد خۆی بێتەوە و دەسەڵات بگرێتەوە دەست، ئەویش گەڕایەوە و سەرکردایەتیی سوپای کرد و جەنگێکی گەورەی دژ بەمەجەریەکان ئەنجامدا و تیایدا موسوڵمانان سەرکەوتن.

ماوەیەک سوڵتان (محمد) چوو بۆ شاری (مانیساو) وەێ مایەوە، لەو ماوەیەدا ژنی هێنا، ناوی ژنەکەی (ئامینە گوڵبەهار) بوو کە بەبنەڕەت خەڵکی (یۆنان) بوو، دوای ماوەیەکی تریش ژنێکی تری هێنا کە ناوی (ستتی) بوو، ئەم ژنەی تورکمان بوو، ئیتر بەردەوام باوکی هاریکاری بوو، تا کێشە گەورەکانی وڵات چارەسەر بکات، چونکە هێشتا (محمد) گەنج بوو و زۆر توانای چارەسەرکردنی کێشە گەورەکانی وڵاتی نەبوو.

دوای ئەوەی باوکی کێشەکانی بۆ چارەسەر کرد، ئەوەبوو لەو ماوەدا کۆچی دوایی کرد، بۆیە (محمد)ی کوڕی گەڕایەوە و شوێنی باوکی گرتەوە، پاش بە خاکسپاردنی تەرمی باوکی ئیتر سوڵتان بە گەرمی کەوتە هەوڵی بەهێزکردنی دەوڵەتەکەی، چونکە دەیزانی نابێت مەرگی کەسە ئازیزەکان ببێتە هۆکاری وەستان لە خزمەتکردن و سەرخستنی ئایینی خوا و باوکیشی هەتا ژیا وا خزمەتی دەکرد، بۆیە دەیویست ئەویش وەک باوکی بێت.

سولْتان (محمد) کەوتە ئامادەسازییەکی چاک، بۆ ئەوەی ئاواتە گەورەکەی بەدیبهێنێت، ئەویش ئازادکردنی شاری(قسطنطنیە)بوو، لەوەشدا (شێخی گۆرانی) هاندەری بوو، بۆ ئەوەش سولْتان سوپای ئامادە کرد و زانایانیش باسی جیهادیان دەکرد بۆ سەربازان تا بەگەرمی بجەنگن، دواجار هێرشیان برد بۆ سەر (قسطنطنیە)و لە ڕووی دەریا و وشکانیشەوە هەڵمەتیان برد، بەڵام ئەوانیش بە سەختی بەرگرییان دەکرد و نەیاندەهێشت موسڵمانان بچنە ناوی، ئیتر ژمارەیەکی زۆری موسڵمانان شەهید بوون.

تەنیا یەک ڕێگە مابووەوە، ئەویش گرتنی ناوچەیەکی ئاوی بوو دەبوو موسوڵمانان لەوێوە بەکەشتی هێرش ببەن تا شارەکە بگرن، بەڵام ڕێگە نەبوو کەشتی بۆ ببەن.

پرسیار: ئەی سولْتان بۆ چارەسەری ئەوە چی کرد؟

وەڵام: سولْتان بڕیاریدا کارێکی زۆر سەخت بکەن، ئەویش ئەوەبوو بەشاخەکەدا کە لە نێوان ئەوان و شوێنە ئاوییەکەدا بوو کەشتی ببەن بۆ ئەو شوێنە، ئەوەش بە شەو بکەن تاوەکو دوژمن پێیان نەزانێت و بەیانی کتوپڕ هێرش بکەنە سەریان، بۆیە سەربازانی موسڵمانان داریان دەبڕیەوە و دارەکانیان چەور دەکردن و بەسەرشاخەکەدا جادەیەکیان پێ دروست کرد، دواتر

بەهەموویانەوە کەشتیەکانیان بەسەریاندا ڕاکێشا و بردنیانە ناوچە ئاوییەکەوە، بەوەش کە ڕۆژ بووەوە دوژمنان تەواو سەرسام بوو و هیوای بەرگریکردنیان نەما و موسوڵمانان توانییان دواجار(قسطنطنیە)ئازاد بکەن.

کاتێک چوونە ئەوێ سوڵتان بڕیاریدا کەس بە ناهەق نەکوژن و خوێنی ژن و منداڵ و پیر و خەڵکی بێتاوان نەڕژن، هەروەها سەربازانی کۆکردەوە و لە خۆشیدا دەستیکرد بەگریان و وتارێکی پێشکەش کرد، موژدەی ئەوەی پێدان کە ئەوان توانییان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە خۆیاندا بەدیبهێنن کە ئەوەش گەورەترین موژدەیە.

کاتێک ناموسوڵمانەکان ئەو لێبوردەیی و نەرمونیانەی سوڵتانی موسوڵمانانیان بینی بەشێکی زۆریان موسوڵمان بوون و بۆیان دەرکەوت ئاینی ئیسلام چەند جوانی و چاکی لە خۆگرتووە.

سوڵتان (محمد) بەم سەرکەوتنەوە نەوەستا، بەڵکو بڕیاری دا هێرش بباتە سەر ناوچەکانی تریش تا ئەو ناوچانەش بخاتە سەر خاکی موسڵمانان و ئایینی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت، بۆ ئەوەش خوای گەورە سەرکەوتنی زۆری پێ بەخشی و بەو هۆیەوە چەندین ناوچە کەوتنە ژێر دەستی موسوڵمانان، خەڵکەکەشی بە

ئارەزووی خۆیان و بەبێ زۆر لێکردن موسڵمان بوون، چونکە کاتێک موسوڵمانان دەچوونە ئەوێ و لەگەڵیان زۆر چاک بوون و باسی ئیسلامیان دەکرد بۆیان، ئەوانیش سەرسام دەبوون بە ئیسلام و بە ڕەزامەندی خۆیان موسوڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیاند.

هەروەها سوڵتان چەندە گرنگی دەدا بەتێکۆشان لە ڕێگەی خوا، هێندەش گرنگی دەدا بەبواری زانست و خوێندنگەکان و لە بەشەکانی وڵاتدا چەندین خوێندنگە، زانکۆ و پەیمانگەی دروست کرد، گرنگی دا بەمەنهەجی خوێندن و ڕێزگرتنی زانایان و یارمەتیدانی خوێندکاران، هەروەها چەندین نەخۆشخانەی گەورەی لە بەشە جیاجیاکانی وڵاتدا بونیاتنا، بەشێکی زۆر کتێبی ناوازە، بە بڕیاری ئەم سوڵتانە وەرگێڕانە سەر زمانی موسوڵمانان، چەندین بینا و دەزگای گەورە و گرنگ بونیاتنران، گرنگییەکی زۆریدا بە بواری ئابووری و بازرگانی زۆر پێشکەوت، هەوڵیدا ستەم لە وڵاتدا نەهێڵێت و مافی ستەم لێکراوانی دەگێڕایەوە بۆیان، بەڵکو خەڵکی هەموان ڕازی بوون بە دەسەڵاتی ئەو سوڵتانە و نزای خێریان بۆ دەکرد، ئەویش تا دوا ساتەکانی تەمەنی خووی نەدایە تەمبەڵی و هەموو هەوڵی خۆی دەخستەگەڕ بۆ خزمەتکردنی خەڵک.

دواجار پاش خزمەتێکی زۆر و سەرکەوتنی گەورەی سوڵتان (محمد) لە بوارە جیاجیاکاندا، ئەویش وادەی مردنی هات و دواجار لە مانگی (ربیع الأول)ی ساڵی ٨٨٦ کۆچیدا و لە تەمەنی پەنجاو سێ ساڵیدا سوڵتان (محمد) کۆچی دوایی کرد.

**پەندو وانە**

دەبێت بەجوانی ئەوە بزانین لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا گەورەیی و لە خواترسان بەپێی ڕەنگ و نەتەوە نییە، بەڵکو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیسلامدا لە خواترسان و پەیڕەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ کات ئیسلام جیاوازی ناکات لە نێوان کورد و عەرەب و تورک و فارس و ئینگلیز و هەر نەتەوەیەکی تردا، بەڵکو جیاوازییەکە لەسەرئەوەیە کامیان کاری چاکە زیاتر بکات، هەر بۆیە ئەو گەلانەی موسوڵمان بوون هەوڵیانداوە پێشبڕکێ بکەن لە کاری چاکە و خزمەتکردن بە پەیامی خوادا.

هەرچییەک فەرموودەی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیە وسلم) لەسەر بێت، دەبێت ئێمەی موسوڵمان زۆر گرنگی پێبدەین چونکە ئەوە مایەی سەرکەوتنمانە لە دونیا و قیامەتدا، دەبینین سوڵتان (محمد) هەموو ماوەی تەمەنی خۆی دانا تا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) بیگرێتەوە، بۆیە پێویستە ئێمەش فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) لە خۆماندا جێبەجێ بکەین و تەمەنمان دابنێین بۆ ئەو بوارە.

زۆر پێویستە ڕێزی تایبەتی مامۆستایان بگرین چونکە ئەوان دڵسۆزی ئێمەن و کاتی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ ئێمە تا

زانستمان فێر بکەن و ڕێی ڕاستمان پیشان بدەن و ماندوبوونی خۆیان لە بیر دەکەن لە بەر ئێمە.

جیهادکردن لە ڕێی خوادا و زانست فێربوون و بڵاوکردنەوەی زانست لە ناو خەڵکدا دوو بواری تەواوکەری یەکترن و بە درێژایی مێژووی ئیسلامی موسوڵمانان بە جێبەجێ کردنی هەردووکیان سەرکەوتنیان بەدی هێناوە.

## پرسیارەکان

| |
|---|
| ١- سوڵتان (محمد) لە ساڵی چەند و، لە کوێ لە دایکبووە؟<br>٢- سوڵتان (محمد) لە چ نەتەوەیەک بوو؟<br>٣- تەمەنی منداڵی سوڵتان (محمد) چۆن بوو؟<br>٤- ئەو مامۆستایە کێ بوو کە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەرسوڵتان (محمد)؟<br>٥- بۆچی سوڵتان (مراد) بۆ جاری دووەم خۆی بوویەوە بەسوڵتان؟<br>٦- بۆچی سوڵتان (محمد) هەوڵیدەدا (قسطنطینە)ئازاد بکات؟<br>٧- سوڵتان (محمد) چۆن (قسطنطینە)ی ئازاد کرد؟<br>٨- ئایا دوای ئازادکردنی(قسطنطنیە)سوڵتان (محمد) چی کرد؟<br>٩- دەتوانیت ئەم چیرۆکە زۆر بە کورتی بنووسیتەوە؟ |

# ئیمامی جویني

هەزار ساڵێک لە مەوبەر جیهانی ئیسلامی تووشی نارەحەتییەکی زۆر ببوو، چونکە خاکی موسوڵمانان بەش بەش ببوو، هەر ناوچەیەک و بەدەست کۆمەڵێکەوە بوو، چەندین بیروباوەڕی جۆراوجۆر تەشەنەیان سەندبوو، ئیتر بوونی زانایانی گەورە و خواناس بۆ ڕێنموونی خەڵک پێویست بوو.

لەو سەروبەندەدا خوای گەورە منداڵێکی بەدایک و باوکێک بەخشي، کە دواتر ئەو منداڵە بووبە زانایەکی گەورە و خزمەتێکی کەم وێنەی پێشکەش بەموسوڵمانان کرد، ئەویش ئیمامی (جویني) بوو.

(جویني) لە بنەڕەتدا ناوی (عبدالملك ابن عبدالله)یە و خەڵکی (جوینە)، ئەم ناوچەش دەکەوێتە باکووری ئێرانەوە، ناوچەیەکی کشتوکاڵی گرنگ بوو و شوێنی هەڵکەوتنی دەیان زانای گەورە بوو، بەڵام باپیرەی (عبدالملك) لە پێناو زانستدا

(جوین)ی جێهێشت و چوو بۆ شاری (نیشابور)، بۆیە دواتر لە ساڵی ٤١٩ ی کۆچیدا (عبدالملك) لەوێ لە دایکبووە و هەر لەوێ گەورە بوو و زانستی وەرگرت و تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد هەر لەوێ مایەوە مەگەر بۆ ماوەیەکی کەم جێی بهێشتایە و خێرا دەگەڕایەوە بۆ ئەوێ.

(جویني) لە بنەماڵەیەکی زانست خواز و زیرەک لە دایکبووە، بنەماڵەکەیان بەوە ناسرابوون، کە ژیانیان لەگەڵ زانستدا بەسەر دەبەن، ئەوەش بەخششێکی خوایی بوو بۆ (جویني)، تا هەر بەمنداڵی لەنێو ئەو بنەماڵەیەدا شەیدای زانست ببێت و زانیارییان لێوەربگرێت، (عبداللە)ی باوکی یەکێک بوو لە زاناکان، کە بۆ دەستخستنی زانست چەندین شار و وڵاتی کردبوو، زانایەکی ناسراو و بەناوبانگ بوو، سەدان خوێندکاری پێگەیاند، (عبداللە) سەرەتا بژێوی ژیانی بەدووبارە نووسینەوەی کتێب دابین دەکرد.

(جويني) لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا بوو، کە باوکی نەخۆش کەوت، ماوەی حەڤدە ڕۆژ نەخۆش بوو، بەڵام هەر چاک نەبوویەوە و بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە وەفاتی کرد، ئەوەش خەمێکی گەورە بوو بۆ (جويني).

(نیشابور)شارێک بوو پڕ بوو لە زانای هەڵکەوتە، ئەوەش دەرفەتێکی چاک بوو بۆ (جويني)، تا چاک خۆی پەروەردە بکات و زانستێکی زۆر وەربگرێت، سەرەتا دەستی کرد بە

فێربوون و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، دوای ئەوە گرنگیدا بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و فەرموودەکانی لەبەردەکرد، تا بوو بە زانایەکی گەورەی ئەو بوارە، پاشان لە بوارەکانی تریشدا زانستێکی زۆری وەرگرت، پاش ئەوەی لە (نیشابور) گەورە بوو و زانستی چاکی وەرگرت، دەستی کرد، بە وانە وتنەوە و وتاردان.

بەڵام پاش ماوەیەک ئاشووبێک لە شاری (نیشابور)دا ڕوویدا، کە (جويني)ناچار کرد شارەکە جێبهێڵێت و ڕووبکاتە ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامی، بۆیە ڕووەو (بغداد)ی پایتەختی موسوڵمانان بەڕێکەوت و دواتر لەوێوە چوو بۆ خاکی (حجاز).

کاتێک ئیمامی (جويني)بۆ حەج چوو بۆ (مكة)، دوای حەج کردنەکە چوو بۆ (مدينه) و ئینجا بیری (مكة)ی کردو گەڕایەوە بۆ ئەوێ و بەڵێنیدا ماوەیەک لەوێ بمێنێتەوە، ماوەی چوار ساڵ لەو دەوروبەرە مایەوە و وانەی دەوتەوە و پێش نوێژی بۆ خەڵک دەکرد، هێندە لە هەردوو مزگەوتی (مكة) و (مدينه) پێش نوێژی کرد تا پێی وترا (امام الحرمين) واتە: پێشەوای مزگەوتی (مكة) و (مدينه).

دوای ئەوە ئیمامی (جويني)گەڕایەوە بۆ شاری (نیشابور)و لەوێ خۆی سەرقاڵ کرد بەوانە وتنەوە و نووسینی کتێب، بەجۆرێک دەیان کتێبی ناوازەی نووسی، کە بوونە

سەرچاوەیەکی گرنگی موسوڵمانان بۆ وەرگرتنی زانست، هەروەها کۆمەڵێکی زۆر خوێندکاری پێگەیاند، کە زیاتر لە سێسەد خوێندکار دەبوون، هەندێک لەوانە بوون بە زانای دیاری ناو موسوڵمانان وەک: ئیمامی غزالی، کە لەم کتێبەدا باسی ژیانەکەیمان کردووە.

پاش ژیانێکی پڕ لە زانست و ماندووبوون، دواجار ئیمامی (جويني) نەخۆش کەوت و تووشی تایەکی زۆر بوو، پاشان جەستەی تەواو لاواز بوو و هێزی لێبڕا، پاشان بردیان بۆ گوندێکی نزیک لە (نیشابور)، کە ئاو و هەوایەکی پاکی هەبوو، بەو هیوایەی تەندروستی چاک بێت، کەچی زیاتر لاواز بوو و دواجار لە ساڵی ٤٧٨ ی کۆچی و لە تەمەنی پەنجا و نۆ ساڵی و لە دوای نوێژی خەوتنان کۆچی دوایی کرد، هەر ئەو شەوە تەرمەکەی برایەوە بۆ (نیشابور)، هەواڵ بڵاوبووەوەو خەم و خەفەت هەمووانی گرتەوە.

**پرسیارەکان:**

١- ئیمامی (جويني) لە کوێ لە دایکبووە؟
٢- بنەماڵەی (جويني)بەچی ناسرابوون؟
٣- شاری (نیشابور) بەچی ناسرابوو؟
٤- باسی گەشتەکەی (جويني)بکە بۆ (مكة)و (مدينە).
٥- (جويني)چۆن کۆچی دوایی کرد؟

## حەسەنی بەسڕی

کەم کەسمان هەیە لە وتار و گوفتاری مامۆستا و زاناکانماندا ناوی (حەسەنی بەسڕی)مان نەبیستبێ، چونکە (حەسەنی بەسڕی) یەکێکە لە زانا گەورە و خواناسە گەورەکانی ئیسلام.

باوکی (حسن) ناوی (یسار) بوو، (یسار)ی باوکی خزمەتی یەکێک لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەکرد کە ئەویش (زیدی کوڕی ثابت) بوو، دایکیشی ناوی (خیرە) بوو و ئەویش خزمەتکاری هاوسەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) (ام سلمە) بوو، واتە (حسن) خاوەنی دایک و باوکێک بوو کە خزمەتی دوو کەسی زۆر نزیکی پێغەمبەری خوایان دەکرد.

لە سەردەمی خیلافەتی (عمر بن خطاب)دا، (یسار) داوای خاتوو (خیرە)ی کردوو بوو بە هاوسەری، دوای ماوەیەک خوای گەورە منداڵێکی چاوگەشی پێدان بەناوی (حسن)، دوو ساڵ پێش ئەوەی (عمر بن خطاب) شەهید بێت، (حسن) لەدایکبوو.

جاری وا هەبوو (ام سلمە) کە دایکی باوەڕداران و هاوسەری پێغەمـبەری خـوا (ﷺ)بـوو، دایکـی (حســن)ی دەنـارد بـۆ کارێک، کە دایکی دەڕۆشت (حسن)دەستی دەکرد بە گریان، (ئوم سەلەمە) مەمکی پێدەدا و ژیری دەکردەوە، دواتر دەیبرد بۆ نـاو هاوەڵەکـانی پێغەمـبەر (ﷺ)، جـا هـاوەڵانی پێغەمـبەر (ﷺ)نزای خێریان بۆ دەکرد، (عمر بـن خطـاب)یـش نـزای خێری بۆ کرد و فەرمووی: خوایە شارەزای بکەیت لە ئیسلامدا و لای خەڵک خۆشەویستی بکەیت.

(حسـن)هەر لە سـەرەتاوە پەروەردەیەکـی جوانی وەرگـرت و لە ناو هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)گەورە بوو، پەروەردەیەکـی ناوازەی وەرگرت تا بوو بەزانایەکی گەورە.

(حەسـەنی بەسـری) زۆر زانـا و زیـرەک بـوو، خواناسـێکی گەورە بـوو، زۆر پەرستشـی خـوای دەکـرد، شێوە و رووخسـارێکی زۆر جوانیشی هەبوو، هێندە جوان بوو کە لە زۆر شوێن ناوبانگی پەیدا کردبوو، زۆر نەرم و نیان و لە سەرخۆ بوو.

(حەسـەنی بەسـری) لە نـاوچەی (وادي القـورا) گەورە بـووە، سـەرەتای ژیـانی لەوێ بەسـەربرد، جارێـک لەسـەر وشـترەکەی کەوتە خوارەوە و لووتی بریندار بوو.

(حەسـەنی بەسـری) گرنگیەکـی زۆری دەدا بەڕۆژوو و گـرتن،

هەمـوو دووشـەممە و پێـنج شـەممانێک بە ڕۆژوو دەبـوو، هەر ڕۆژوویەکـی تـری سـوننەتیش هەبـوایە، (حەسـەنی بەسـڕی) نەیدەهێشت لە دەستی بچێت و بە ڕۆژوو دەبوو.

خواناسێک هەبـوو بەنـاوی (حمزە)، دایکـی بـردی بـۆ لای (حەسـەنی بەسڕی) و، وتـی: حەز دەکەم کـوڕەکەم لەگەڵ تـۆ بێـت بەڵکـو خـوای گەورە ڕێنمـوونی زیـاتری بکـات، (حەسـەنی بەسـڕی)یـش زۆر گرنگـی پێـدەدا، ڕۆژێـک ئامۆژگـاریەکی کـردوو وتـی: کـوڕە شـیرینەکەم زۆر خەفەت بخـۆ بـۆ ڕۆژی دوایی و گرنگیەکی زۆر بدە بەپەرستشی تەنیا و نهێنی.

جـا (حەمـزە) دەڵێـت: جـار هەبـوو دەچـووم بـۆ لای دەمبینـی (حەسەنی بەسڕی) دەگریت.

منیش پێم وت: بۆچی هێندە دەگریت؟

ئەویـش دەیـوت: گریـان لە ترسـی خـوا ڕەحمەتـی لەگەڵە و لە دۆزەخ ڕزگارت دەکات.

(حەسـەنی بەسـڕی) لە مزگەوتـدا وانەی دەوتەوە، ڕۆژانە وانەکانی قورئان و فەرموودە و زمانەوانی و چەند وانەی تری بە موسـوڵمانان دەوتەوە. خوێنـدکارێکی زۆری هەبـوو و سـەدان کەسی پێگەیاند.

جارێک کەسێک هات بۆ لای (حەسەنی بەسڕی) و وتـی:

فلانەکەس غەیبەتی تۆی دەکرد، ئەویش پاکەتێک شیرینی نارد بۆ ئەو کەسەی کە غەیبەتی کردبوو و نامەیەکیشی بۆ نووسی و تیایدا نووسیبوی: بیستوومە تۆ چاکەکانی خۆت بە دیاری بە من بەخشیوە، بۆیە منیش ئەم شیرینییەم بۆ ناردیت.

(حەسەنی بەسرِی) نەخۆش کەوت و خەریک بوو بمرێت، خۆی هەستی کرد کە سەرەمەرگی هاتووە، بۆیە هەندێک وەسیەتی کرد بۆ (عبدالله) کوڕی، دواجار لە شەوی هەینی مانگی رەجەبی ساڵی سەد و دەی کۆچیدا وەفاتی کرد و تەمەنی نزیکەی هەشتا و هەشت ساڵ بوو.

**پرسیارەکان:**

١- دایک و باوکی (حەسەن)کێ بوون؟
٢- پەیوەندی (حەسەن) لەگەڵ (ام سلمه) چۆن بوو؟
٣- بۆچی (حەسەنی بەسرِی) زۆر دەگریا؟
٤- بۆچی (حەسەنی بەسرِی) شیرینی نارد بۆ ئەو کەسەی غەیبەتی کردبوو؟
٥- دەتوانیت ژیانی (حەسەنی بەسرِی) بۆ خۆشەویستێکت باس بکەیت؟

# ئیمامی سوفیان

ناوی (سوفیانی کوڕی عویەین)ە، ئەم زانا خواناسە لە شارێکی (عراق) لە دایکبوو کە ئەویش شاری (کوفة)یە، لە بەرەبەیانێکی ڕۆژی شەممە و لە مانگی شەوالی ساڵی سەدو حەوتی کۆچییدا لەدایکبووە.

(عویەینە)ی باوکی لە کاربەدەستانی ئەو ناوچەیە بوو، بەڵام دواتر کە لەسەر کار لابرا، چوو بۆ شاری (مکة) و لەوێ نیشتەجێ بوو.

(سوفیان) نۆ برای هەبوو کە هەموویان موسوڵمان بوون، چوار لە براکانیشی زانای بواری فەرمووده بوون و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەگێڕایەوە.

(سوفیان) هەر لە سەرەتای ژیانییەوە دەستیکرد بە وەرگرتنی زانست، سەرەتاش چووە خزمەتی مامۆستایان و دەستی کرد بە فێربوون و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، لە تەمەنی حەوت ساڵییدا هەموو قورئانی لەبەرکرد، ئەوەش بەخششێکی خوایی بوو کە توانی لەو تەمەنە کەمەدا هەموو قورئانی پیرۆز بە جوانی و ڕەوانی لەبەر بکات.

دوای ئەوەش هەر زانستی وەردەگرت تا تەمەنی بوو بە پانزە ساڵ، ئیتر لەو کاتەوە دەستی کرد بە وەرگرتن و لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ڕۆژێک باوکی بانگی کرد و وتی: ڕۆڵە گیان ئیتر گەورە بوویت و هەوڵبدە چی خێر و چاکەیە فێری ببە، ڕۆڵە گیان ئەگەر هیچ هاوڕێت نەبێت زۆر باشترە لەوەی هاوڕێی خراپت هەبێت، تا دەتوانیت گوێڕایەڵی ڕێنمایی زانایان ببە، چونکە هەرکەس وابکات بەختەوەر و براوە دەبێت، (سوفیان)یش ئامۆژگارییەکانی باوکی بەهەند وەرگرت و تا ئەو کاتەی لە ژیاندا بوو لە بیری نەچوو.

ئیتر (سوفیان) بەردەوام دەچوویە خزمەت زانایانی فەرموودە و لە خزمەتیاندا دادەنیشت و فەرموودەی لێوەردەگرتن و دەینووسیەوە و بە جوانی لەبەریدەکرد.

جارێک (سوفیان) لەگەڵ یەکێک لە زاناکان لە پاڵ کەعبەدا بوو، زاناکەش ناوی (عەمری کوڕی دینار) بوو، (سفیان) داوای لێکرد فەرموودەی فێر بکات، ئەویش هەشت فەرموودەی بۆ گێڕایەوە، ئینجا (سوفیان) گوێدرێژەکەی مامۆستاکەی ڕاگرت تا مامۆستاکەی نوێژەکەی بکات، کاتێک (عەمر)ی مامۆستای هاتەدەرەوە (سوفیان) هەر هەشت فەرموودەکەی بە لەبەرکردنەوە دووبارە کردەوە، مامۆستاکەشی سەرسام بوو بەزیرەکی (سوفیان).

(سوفیان) هێندە گرنگیدا بەفەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

کە لە هەموو شوێنێک ناوبانگی پەیدا کرد و دواجار بوو بەزانایەکی گەورەی بواری فەرموودە و خەڵکی لە هەموو شوێنێکەوە دەهاتنە خزمەتی و فەرموودەیان لێوە دەبیست.

(سوفیان) کاتێک فەرموودەیەکی وەردەگرت، پێشتر جوان لەبەری دەکرد ئینجا دەینووسیەوە، دواتریش هەم دەیخوێندەوە، خۆی دەڵێت هەر فەرموودەیەکم نووسیبێتەوە پێش ئەوەی بینووسمەوە بەجوانی لەبەرمکردووە.

(سوفیان) نەوەک تەنیا لای خەڵک خۆشەویست بوو، بەڵکو تەنانەت لای سەرکردەکانی موسوڵمانانیش زۆر ڕێزدار و خۆشەویست بوو، سەرکردەی ئەو کاتی موسوڵمانان کە (هارون الرشید) بوو هەرکات ناوی (سوفیان)ی ببردایە دەیوت گەورەی خەڵک، چونکە دەیزانی هەموو قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناو دڵی (سوفیان)دان.

(سوفیان) دەیوت: زانای ئیشکەر ئەو کەسەیە کە بەتەواوەتی شەریعەتی خودا جێبەجێ بکات، ئیتر خەڵکی پێش ئەوەی گوێ لە زانستەکەی بگرن، بە کردەوەکانی سوود وەربگرن.

واتە پێویستە زانای موسوڵمان هەرچی زانستێکی لابوو بەکردەوە جێبەجێی بکات، نەوەک شتێک بەخەڵک بڵێت و خۆی جێبەجێی نەکات، چونکە خوای گەورە هەڕەشەی کردووە لەو جۆرە زانایانە کەشتێک بەخەڵک بڵێن و خۆیان نەیکەن.

هەروەها دەیوت: هەر موسوڵمانێک خۆی لە موسوڵمانێکی تر بە باشتر و گەورەتر بزانێت، ئەوە خۆبەزلزانە.

(سوفیان) تەمەنێکی زۆر ژیا، کۆتا جار چوو بۆ حەج، لەوێ جلێکی خۆی راخست و لە سەری ڕاکشا و وتی وا حەفتا ساڵە دێمە ئەم شوێنە و هەموو جارێک وتوومە خوایە ئەمە کۆتا جارم نەبێت دێمە ئێرە، بەڵام ئیتر ڕووم نایە داوای لێ بکەم، ئەوەبوو ئەو جارەیان داوای نەکرد، هەر لەو ساڵەدا و لە ڕۆژی شەممەی مانگی رەجەبی ساڵی سەد و نەوەد و هەشتی کۆچیدا وەفاتی کرد.

**پرسیارەکان:**

١- (سوفیان) لە تەمەنی چەند ساڵیدا هەموو قورئانی لەبەر کردبوو؟
٢- ئامۆژگاری باوکی (سوفیان) بۆ کوڕەکەی چی بوو؟
٣- بەسەرهاتی (سوفیان) و (عەمری کوڕی دینار) چۆن بوو؟
٤- (هارون الرشید) چۆن ناوی (سوفیان)ی دەبرد؟
٥- (سوفیان) لە کۆتا حەجیدا چی وت؟

# سوڵتان قوتز

یەکێک لە سەرکردە دیار و گەورەکانی ناو مێژووی ئیسلامی کە توانی خزمەتێکی گەورە پێشکەش بە موسوڵمانان بکات کەسێک بوو بەناوی (قوتز) کە توانی ببێت بە سوڵتان و سەرکردەی موسوڵمانان و دوژمنی گەورەی ئیسلام لە ناوبەرێت.

(قوتز) سەرەتا کۆیلەیەک بوو لە بازاڕی کۆیلە فرۆشاندا دەفرۆشرا، ئەوەبوو سەرکردەیەکی موسوڵمانان ئەوی کڕی و چاک پەروەردەی کرد و خزمەتی کرد، لەسەر مەشقی سەربازی ڕایهێنا، هەر لە سەردەمی کۆیلایەتییەکەیدا کە پەروەردەی سەربازی وەردەگرت، خەونی بەوەوە دەبینی ببێتە سەرکردەیەک و مەغۆلەکان لە ناوبەرێت.

پرسیار: مەغۆلەکان کێ بوون؟

وەڵام: مەغۆلەکان ئەو نەتەوە دڕندە مرۆڤ کوژانە بوون کە لە خۆرهەڵاتەوە هێرشیان هێنا بۆ جیهانی ئیسلامی و بچوونایەتە هەر شارێک کوشت و بڕی موسوڵمانانیان دەکرد و دەستیان

نەدەپاراست لە کوشتنی ژن و منداڵیش.

(قوتز) لە خزمەتی سەربازی یەکێک لە پاشا گەورەکانی ئەیووبیەکاندا بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ بەهۆی بەهێزییەوە تواناکانی دەردەکەوتن، ئیتر دوای لاوازبوون و نەمانی ئەییووبیەکان، (قوتز) توانی بەماوەیەکی کەم دەسەڵات وەربگرێت و مەترسییەکانی سەر دەسەڵاتەکەی و ململانێ ناوخۆییەکان نەهێڵێت.

لەوکاتەدا مەغۆلەکان هێرشیان هێنایە سەر (بغداد) و توانییان پایتەختی ئەوکاتی موسوڵمانان داگیر بکەن و کوشتارێکی زۆریان تێدا کرد، ئیتر زۆربەی خاکی موسوڵمانان کەوتبووە دەست مەغۆلەکان و بەشێکی زۆر کەمی مابووەوە کە ئەویش لە دەستی سوڵتان (قوتز)دا بوو.

سەرکردەی مەغۆلەکان ناوی (هۆلاکۆ)بوو ویستی ئەو ناوچانەی تریش داگیر بکات، بۆیە نامەیەکی نووسی بۆ سوڵتان (قوتز) و داوای لێکرد ناوچەکان بدات بەدەستەوە، ئەویش هەموو سەرکردەکانی کۆکردەوە و تێیگەیاندن نابێت خۆیان بدەن بەدەستەوە و دەبێت هەوڵبدەن هەموو خاکی موسوڵمانان ئازاد بکەن و مەغۆلە دڕندەکان لەناو ببەن، پاش مشتومڕێکی زۆر دواجار هەموویان یەکدەنگ بوون کە خۆیان نەدەن بەدەستەوە و بجەنگن.

سوڵتان (قوتز) بڕیاریدا پێش هێرشی مەغۆلەکان هەنگاو

بنێت و هێرش ببات بۆ ئەوەی پێشڕەوی مەغۆلەکان بوەستێنێت و خاکی موسوڵمانان لە دەست بێباوەڕان وەربگرێتەوە، جا یەکێک لە هاوڕێ دێرینەکانیشی کە سەرکردەیەکی بەهێزی سەربازیی بوو، ناوی (بیبرس) بوو ئامادەیی دەربڕی پشتیوانی لە سوڵتان (قوتز) بکات، بەو شێوەیە هەموویان بەرەیەکی بەهێزیان پێکهێنا و دواجار توانییان لە جەنگێکدا کە پێیوتراوە جەنگی (عین جالوت) مەغۆلەکان بشکێنن و سەرکردەی مەغۆلەکانیش بکوژن، ئەوەش وەک دانانی بەردێکی گەورە وابوو لە بەردەم هێرشی مەغۆلەکاندا، ئیتر لەوە بەدواوە مەغۆلەکان لە بەردەم موسوڵماناندا دەشکان.

هەواڵی شکستی مەغۆلەکان هەموو موسوڵمانانی دڵخۆش کرد و هەر موسوڵمانێک ئەو هەواڵەی دەبیست هێندە خۆشحاڵ دەبوو، وەک ئەوە وابوو خەڵاتێکی گەورەی پێبەخشرابێت.

بەڵام بەدوای ئەو خۆشییەدا ناخۆشییەک هات، ئەویش ئەوە بوو سوڵتان لە کاتی گەڕانەوەیدا بەرەو شوێنی خۆی، لە لایەن هاوڕێ دێرینەکەی خۆیەوە کوژرا، (بیبرس)ی هاوڕێی سەرکردەیەکی بەهێز بوو لەگەڵ (قوتز)دا کەوتە ناکۆکی و دواجار گەیشتە ئەوەی (قوتز)ی هاوڕێی خۆی بکوژێت و خۆی لە شوێنەکەی ئەودا دەسەڵات وەربگرێت.

پەند و وانە: هەڵەیەکی بەردەوامی موسوڵمانان بریتی بووە لە

ناکۆکی نێوانیان و هەمیشە بەهۆی ئەو ناکۆکییانەوە ڕووداوی ناخۆش تووشی موسوڵمانان بووە، بۆیە زۆر پێویستە هەوڵبدەین ناکۆکییەکان نەهێڵین و هەرکات ناکۆکییەکیش درێژەی کێشا هەوڵبدەین بچووکی بکەینەوە تا لەناو دەچێت، بەڵکو نابێت ڕێگە بدەین یەکڕیزیی موسوڵمانان بشێوێنێت.

**پرسیار:**

١- (قوتز) سەرەتا چی بوو؟
٢- (قوتز) چۆن دەسەڵاتی وەرگرت؟
٣- مەغۆلەکان کێ بوون؟
٤- جەنگی (عین جالوت) چی بوو؟
٥- سوڵتان قوتز چۆن کۆتایی بە ژیانی هات؟

## عبداللەی کوڕی مبارک

پیاوێکی گەورە و خواناسی ناو مێژووی موسوڵمانان کە وەک زانایەکی گەورە ناسراوە (عبداللەی کوڕی مبارک)ە، جا بۆ سوود وەرگرتن لە ژیانی ئەم پیاوە گەورە و زانا ناسراوە دەچینە خزمەت ژیانەکەی.

(عبداللەی کوڕی مبارک) بە ڕەچەڵەک تورکە، باوکی تورک و دایکیشی خوارزمی بوو، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە لە ئیسلامدا دەمارگیری ڕەگەزی نییە و خوای گەورە ئیسلامی تایبەت نەکردووە بەنەتەوەیەکەوە و هەرکەس بەدروستی بنەوێتە ئایینی ئیسلام، خوای گەورە ڕێز و گەورەیی پێدەبەخشێت.

باوکی (عبدالله) سەرەتا کۆیلەیەکبوو، کۆیلەی پیاوێکی بازرگان بوو، ئەم کۆیلە هەژارە کەسێکی زۆر خواناس بوو، پەرستشی زۆر زۆر بوو، جا کابرای دەوڵەمەند باخێکی هەبوو، (مبارک) سەرپەرشتی دەکرد، جارێک کابرا هات و داوای هەنارێکی شیرینی کرد تا (مبارک) بۆی لێبکاتەوە، ئەویش

چوو هەنارێکی بۆ هێنا، کەچی هەنارەکە ترش بوو، کابرا تووڕە بوو. وتی: من داوای هەناری شیرین دەکەم و تۆیش هەناری ترشم بۆ دێنیت؟ (مبارک) دوو جاری تر هەناری بۆ هێنا هەر ترش بوو.

کابرا وتی: یانی تۆ هەناری ترش و شیرینی ئەم باخە ناناسیتەوە؟

ئەویش وتی: نا.

کابرا وتی:بۆچی؟

(مبارک) وتی: من تا ئێستا هیچم لە هەناری ئەم باخە نەخواردووە تابزانم کامیان شیرین و کامیان ترشە.

کابرا وتی: ئەی بۆچی نەتخواردووە؟

ئەویش وتی: تۆ مۆڵەتت پێنەداوم لێی بخۆم.

کابرای خاوەن باخ بە ڕەوشت بەرزی و پاکی (مبارک) سەرسام بوو، جا کچێکی هەبوو داواکاری زۆر زۆر بوو، کابرا بە (مبارک)ی وت: بۆچی ئەم کچەم بە هاوسەر ناگریت؟ ئەوەبوو (مبارک)یش بەهاوسەری گرت، دواتر لە ساڵی سەد و هەژدەی کۆچیدا خوای گەورە منداڵێکی پێبەخشین بەناوی (عبدالله).

(عبدالله) لە شاری (مەرو) دەژیا، ئەو شارەش پڕ بوو لە

زانای گەورە، ماوەی بیست ساڵ لەوێ ژیا. سەرەتا لە خوێندنگە وانەی دەخوێند، جارێک زانایەک وتارێکی پێشکەش کرد، کە تەواو بوو، (عبداللە) هەموو وتارەکەی لە بەرکردبوو، هەمووی دووبارە کردەوە، لێوەشاوەییەکەی بەخششێکی خوایی بوو.

بەڵام دوای ماوەیەک (عبداللە) تاقەتی خوێندنی نەما، پاشان خووی دایە یاری و گەمە و کات بەسەربردن، شەوێک کە خەریکی کات بەسەربردن بوون، خەوی لێکەوت و خەوێکی بینی، تیایدا باڵندەیەک ئایەتێکی قورئانی بۆ خوێندەوە، (عبداللە)ش ڕاچڵەکی و تەوبەی کرد و بڕیاریدا ئیتر کاتەکانی لە پەرستش و وەرگرتنی زانستدا بەسەر ببات.

(عبداللە) زۆر گرنگیدەدا بە فەرمووده و تەواو تامەزرۆی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، دەیوت تا مردن واز لەوەرگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)،ناهێنم. جارێک (عبداللە) فەرموودەیەکی بیست، بڕیاریدا بچێت بۆلای ئەو مامۆستایەی فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە، بەڵام مامۆستاکە لە شارێکی زۆر دوور بوو، نزیکەی هەزار کیلۆمەتر دوور بوو، ئەو کاتەش سەیارە نەبوو تا خێرا بگات، (عبداللە) کۆڵی پێچایەوە و کەوتەڕێ تاگەیشتە لای مامۆستاکە و فەرموودەکەی لێ بیست، ئینجا گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی.

هاوکات لەگەڵ وەرگرتنی زانستدا، (عبداللە) سەرقاڵی

بازرگـــانیش بـــوو، ئەوەشـــی لە بـــاوکیەوە وەرگـــرت کە دوای هاوسەرگیری دەستی کرد بەبازرگانی، هەم لە مامۆستاکەیەوە کە ئیمـامی (أبـو حنیفه)بـوو و سـەرقاڵی کـاری بازرگـانی بـوو، چـونکە (عبـدالله) دەیزانـی دەبێـت موسـوڵمان لە بەری رەنجـی خۆی بخـوات و نەبێت بە ئەرک بەسـەر خەڵکـی تـرەوە، بەڵکـو خوای گەورە موسوڵمانی ئیشکەر و بەخشەری خۆشتر دەوێت لە کەسێک کە هەمیشـە ئەرک و بـارگرانی بـۆ خەڵکـی دروسـت دەکات.

جارێک پیاوێک پێیوت ئەی (عبدالله) خۆ تۆ باس لەوە دەکەیت بیرو خەیاڵمان لای دونیا نەبێت و وریای قیامەتمان بین، کەچی خۆت سەرقاڵی بازرگانیت. ئەویش وتی: ئاخۆ من بازرگانی دەکەم تا چاوم لە دەستی خەڵک نەبێت و پارەکەشی لە رێگەی خوادا ببەخشم، لە هەر شوێنێک دەرفەت بووبێت خێرم کردووە، ئەوەبوو (عبدالله) ساڵانە پارەیەکی زۆر زۆری تایبەت کردبوو بەو کەسە خواناسانەی خۆیان بۆ زانست و خواپەرستی یەکلایی کردبووەوە.

جارێک کابرایەکی نەخۆش هات بۆلای (عبدالله) و وتی: من وا حەوت ساڵە نەخۆشییەکم هەیە چارەسەر نابێت، دەرمانی جۆراوجۆریشم بۆ بەکارهێناوە.

ئەویش وتی: بڕۆ بزانە لە کوێدا خەڵکی پێویستیان بە ئاوە، لە

ڕێی خوادا بیرێکیان بۆ هەڵکەنە پشت بەخوا چاک دەبیتەوە، کابراش چوو وایکرد، خوای گەورەش شیفایدا و چاک بووەوە.

هەروەها (عبدالله) بەشداریی جیهاد و غەزای ڕێی خوای دەکرد، ئەوەبوو جارێک لە غەزایەک گەڕایەوە و لە ڕێدا لە شارۆچکەیەک لایدا بەناوی (هیت)، لەوێ وادەی ژیانی کۆتایی هات و لە ساڵی سەدو هەشتا و یەکی کۆچی و لە مانگی ڕەمەزان و لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**پرسیار:**

| |
|---|
| ١- بۆچی باوکی (عبدالله) هەناری شیرینی ناو باخەکەی نەدەناسیەوە؟<br>٢- (عبدالله) چۆن تەوبەی کرد؟<br>٣- هەڵوێستی (عبدالله) بەرانبەر بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) چۆن بوو؟<br>٤- (عبدالله) چی وت بە کابرای نەخۆش؟<br>٥- بۆچی (عبدالله) بازرگانی دەکرد؟ |

# عیززی کوڕی عبدالسلام

ئەم زانا پایەبەرزەی ئێستا باسی دەکەین هێندە گەورە و ڕێزدارە کە لای موسوڵمانان ناسراوە بە(سوڵتانی زانایان)، ئەویش ناوی (عبدالعزیز ابن عبدالسلام)ە و زیاتر بە (عیززی کوڕی عبدالعزیز) ناسراوە.

(عبدالعزیز) لە ساڵی ٥٧٧ ی کۆچی لە (دمشق) لە دایکبوو، بە بنەڕەت خەڵکی باکووری (ئەفریقا) بوو، بەڵام یەکێک لە باپیرە گەورەکانی هاتە (دمشق) و لەوێ نیشتەجێبوو.

دایک و باوکی (عبدالعزیز) کەسانی هەژار بوون و لە ڕووی دارایییەوە دەست کورت بوون، ئەمەش وایکرد ئەم کەسایەتییە لەگەڵ سەختییەکانی ژیاندا خۆی بگونجێنێت.

(عبدالعزیز) هەر لە (دمشق) گەورە بوو، لەوێ کەوتە وەرگرتنی زانست، سەرەتا لەوێ ئیشی دەکرد، چونکە خێزانێکی هەژار بوون، بەڵام دواتر بڕیاریدا گرنگی زیاتر بدات بە زانست، چونکە (دمشق) پڕ بوو لە زانای گەورە و شارەزای هەموو بوارەکان، ئەوەش دەرفەتێکی گەورە بوو بۆ (عبدالعزیز)

تابتوانێت لە هەر بوارێکدا بیەوێت زانست لە زانایان وەربگرێت.

(عبدالعزیز) زۆر بەتاسەوە زانستی وەردەگرت و هەر وانەیەکی بخوێندایە هێندە جوان وەریدەگرت مامۆستاکەی پێی دەوت ئیتر پێویستیت بەهیچ نییە، شەوانەش پێش خەوتنی هەرچی خوێندبوو دەیهێنایەوە بیری خۆی و دووبارەی دەکردەوە.

هاوکات (عبدالعزیز) چەندە زانستی لە زانایان وەردەگرت، هێندەش ڕەوشتی جوان و ئاکاری بەرزی لەو زانایانە وەردەگرت، زۆر بە جوانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و زانستەکانی تری وەرگرت، یەکێک لە مامۆستاکانی (عبدالعزیز) زانایەکی کورد بوو بەناوی (سەیف ئەلدینی ئامەدی)، (عبدالعزیز) زۆر زۆر سەرسام بوو بە زانایی (سەیف ئەلدینی ئامەدی) و زانستێکی زۆری لێوەرگرت.

دواتر (عبدالعزیز) بڕیاریدا بۆ وەرگرتنی زانست بچێتە ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامی و ڕوویکردە (بغداد) پایتەختی موسوڵمانان، هەروەها بۆ گەیاندن و بڵاوکردنەوەی زانست بڕیاریدا بچێت بۆ (مصر)، جگە لەوەش سەفەرێکی کرد بۆ خاکی (حجاز) و هەر لەوێ حەج و عومرەی بەجێگەیاند.

(عیززی کوڕی عبدالعزیز) بەرانبەر بەدەسەڵاتدارانی ناوچەکان زۆر توندبوو، ئامادە نەبوو لە پێناو بەرژەوەندی دونیایی خۆیدا چاوپۆشی بکات لە خراپە و تاوانی دەسەڵاتداران، توندیەکەشی بەرانبەر بەکاری خراپی دەسەڵاتداران بوو، ئەگەرنا لە کارە چاکەکانیاندا زیاتر هانی دەدان.

(عیززی کوڕی عبدالعزیز) ژیانی ڕۆژانەی خۆی بەچەند کارێک بەسەر دەبرد کە بریتیبوون لە: بە جێگەیاندنی پەرستشەکان وەک نوێژ و ڕۆژوو و یادی خوا و زیکرەکان، گرنگییەکی زۆری دەدا بەم بوارە، هەروەها فەتوای دەدا بۆ خەڵک و وەڵامی پرسیاری خەڵکی دەدایەوە و کێشەکانی بۆ ڕوون دەکردنەوە، هەروەها خوێندکارێکی زۆری هەبوو، وانەی پێدەوتنەوە و زانستی لە ناو خەڵکدا بڵاودەکردەوە، زۆر جار دوای نوێژەکان و هەروەها ڕۆژانی هەینیش وتاری دەخوێندەوە بۆ خەڵک و ئامۆژگاری پێویستی پێشکەش دەکردن، هەروەها (عبدالعزیز) دادوەری نێوان خەڵکی دەکرد و لە کێشە و گرفتەکانیاندا بڕیاری یەکلاکەرەوەی دەدا.

جارێک برسێتی و هەژاریی لە ناو خەڵکدا بڵاوبووەوە و خەڵکی لە بەر هەژاری بەهەرزان باخی خۆیان دەفرۆشت، ژنەکەی (عبدالعزیز)یش پارەیدا بە (عبدالعزیز) وتی: بڕۆ باخێکمان بۆ بکڕە. ئەویش چوو پارەکەی کرد بەخێر و بڕێک هەژاری تێر کرد، کاتێک گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

ژنەکەی پێیوت: ئەرێ باخەکەت بۆ کڕین؟

ئەویش وتی: بەڵێ، ژنەکەی وتی لە چ شوێنێک؟ وتی: لە بەهەشت.

ژنەکەشی لە مەبەستەکەی تێگەیشت و دەستخۆشی لێکرد و سوپاسی خوای لەسەرکرد.

بەخشندەیی (عبدالعزیز) گەیشتبوویە ئاستێک ئەگەر کەسێکی هەژار داوای یارمەتی لێبکردایە و ئەویش هیچی نەبووایە مێزەرەکەی سەری پێدەبەخشی، ئەوەش سیفەتی زانای موسوڵمانانە کە دەبێت لە ڕەوشت بەرزی و چاکەکاریدا پێشەنگی جەماوەر بێت.

دواجار ئەم زانا گەورە و خواناسە لە ساڵی ٦٦٠ ی کۆچی و لە تەمەنی هەشتا و سێ ساڵیدا لە (قاهرە) لەوڵاتی (مصر) کۆچی دوایی کرد، خەڵکی بەبیستنی هەواڵی وەفاتی زۆر دڵگران بوون و جەماوەرێکی زۆر ئامادەی نوێژ لەسەرکردنی بوون.

**پرسیار:**

١- دایک و باوکی (عیززی کوڕی عبدالعزیز) چۆن بوون؟
٢- باسی بواری زانستخوازی (عبدالعزیز) بکە؟
٣- بەسەرهاتی کڕینی باخەکە چۆن بوو؟
٤- ژیانی ڕۆژانەی (عبدالعزیز) چۆن بوو؟
٥- سێ پەندو وانە لە ژیانی ئیمامی (عیززی کوڕی عبدالعزیز) باس بکە.

## عبدالقادری گەیلانی

ئەمجارە دەچینە خزمەت زانایەکی تری موسوڵمان، زانایەک کە هەر بەناوهێنانی کەسێکی خواناس و چاکەکارمان دێتە پێش چاو، ئەویش شێخ *(عبدالقادری گەیلانیی)*ە.

ئەم زانا خواناسە لە ساڵی ٤٧٠ ی کۆچییدا لە (گەیلان) لە دایکبووە، ئەم زانا ئازیزەمان بەرەچەڵەک دەچێتەوە سەر پێغەمبەری ئازیزمان (محمد) (ﷺ).

(عبدالقادر) لە گوندێک بەناوی (نیف) لە ناوچەی (گەیلان) لە باکووری (ئیران) لە دایکبوو، کۆتا منداڵی دایک و باوکی بوو ،ماوەیەکی کەم دوای لە دایکبوونی، باوکی کۆچی دوایی کرد و (عبدالقادر) هەتیو کەوت، ئیتر دایکی سەرپەرشتی (عبدالقادر)ی دەکرد، دایکیشی ئافرەتێکی خواناس و پاک و چاکەکار بوو، باپیرەشی چاوی لە هەردووکیان بوو، باپیرەی (عبدالقادر) پیاوێکی خواناس و دونیا نەویست بوو، پەرستشی زۆر بوو.

ئەم خواناسییەی باوک و دایک و باپیرەی (عبدالقادر)، بوو بەمایەی خێر و چاکە بۆی و (عبدالقادر) پەروەردەیەکی چاکی وەرگرت و هەر لە سەرەتاوە فێری خواناسی و ڕەوشتی جوان بوو.

لە گوندەکەی خۆیاندا پارچە زەویەکیان هەبوو لەگەڵ چەند مانگا و ئاژەڵێک، (عبدالقادر) لەوێ سەرقاڵی کشتوکاڵ کردن بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بیر و خەیاڵی لای خوێندن و وەرگرتنی زانست بوو.

(عبدالقادر) هەر لە سەرەتاوە دەستیکرد بەوەرگرتنی زانست لە ناوچەکەی خۆیان، تا توانی زانستی وەرگرت، دواتر حەزی کرد بچێتە ناوچەکانی تر و زانستی زیاتر بەدەست بخات، بۆیە ڕوویکردە (بغداد)، ئەوکات پایتەختی موسوڵمانان بوو، پڕ بوو لە زانای گەورە.

کاتێک ویستی بچێت بۆ (بغداد)، چوو ڕاوێژی کرد بە دایکی، دایکیشی دەستیکرد بەگریان و خەفەت دایگرت، چونکە کوڕەکەی لێی دووردەکەوتەوە، بەڵام لە بەرئەوەی لە پێناو وەرگرتنی زانستدا بوو، مۆڵەتی دا بەکوڕەکەی تا بڕوات.

دایکی هەشتا دیناری هەبوو، ئەوە هەموو داهاتێکیماڵیان بوو، هەمووی دا بە (عبدالقادر)ی کوڕی تا لەگەڵ خۆی بیبات و بەشی خەرجی ماوەیەکی بکات، بەڵام (عبدالقادر)

تەنیا نیوەی ئەو پارەی برد و ئەوی تری جێهێشت، ئەو کاتەی (عبدالقادر) لەگەڵ کاروانەکەدا کەوتەڕێ، دایکی بانگی کرد و کۆتا ئامۆژگاریی خۆی بۆ کرد و وتی: ڕۆڵە گیان وریابە هەرگیز درۆ نەکەیت، چونکە کەسی باوەڕدار درۆ ناکات، کوڕە شیرینەکەم هەمیشە ڕاستگۆبە چونکە وا پەروەردەم کردوویت و هیوام وایە هەمیشە ڕاستگۆ بیت.

لە نیوەی ڕێگەدا کۆمەڵێک چەتە و ڕێگر هاتە ڕێگەیان شتومەکی خەڵکەکەیان برد، کاتێک دزەکان بۆ کەلوپەل و پارەی خەڵکەکە دەگەڕان، یەکێک لە دزەکان بە (عبدالقادر)ی وت: ئەرێ تۆ هیچ پارەت پێیە؟

(عبدالقادر) وتی: بەڵێ، چل دینارم پێیە.

دزەکە بڕوای نەکرد، چونکە هەمووان دەیانویست شتەکانی خۆیان بشارنەوە، کەچی ئەم گەنجە شتەکەی خۆی نەدەشاردەوە، بۆیە دووبارە پرسیاری لێکرد.

ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی: بەڵێ چل دینارم پێیە، دزەکە سەری سوڕما و (عبدالقادر)ی برد بۆ لای گەورە و سەرکردەکەیان و *مەسەلەکەی* بۆ باسکرد.

سەرکردەی دزەکان بە (عبدالقادر)ی وت: بۆچی ڕاستیت وت و پارەکەی خۆتت ئاشکرا کرد؟

ئەویش وتی: ئاخۆ دایکم ئامۆژگاری کردووم هەرگیز درۆ نەکەم چونکە کەسی بڕوادار هەرگیز درۆ ناکات.

سەرکردەکە زۆر سەرسام بوو، دەستی کرد بەگریان.

وتی: ڕۆڵە گیان تۆ تەنیا لەبەر ئامۆژگارییەکی دایکت درۆ ناکەیت، کەچی ئێمە چەند ساڵە فەرمانی خوامان پشتگوێ خستووە و دزی دەکەین، تۆ شاهیدبە من تەوبەم کرد و واز لە دزی و خراپە دەهێنم، ئینجا هاوڕێ دزەکانی تریشی تەوبەیان کرد و هەرچییان بردبوو هەموویان گێڕایەوە بۆ خەڵکەکە و کاروانەکەش بەسەلامەتی گەیشتنە (بغداد)

پەندو وانە: گوێڕایەڵی ئامۆژگاری دایک و باوک ئەرکی سەرشانی موسوڵمانە و دەبێت هەرچییان وت بەگوێیان بکەین، مەگەر کارێکی خراپمان پێبڵێن ئەوکات بەگوێیان نەکەین، هەروەها دەبێت وەک (عبدالقادر) تا دەتوانین ڕاستگۆبین، چونکە درۆ ئاکار و ڕەوشتی دووڕووەکانە و کەسی موسوڵمان دەبێت هەمیشە ڕاستگۆبێت بۆ ئەوەی خوای گەورە وەک ڕاستگۆ ناوی بنوسێت.

(عبدالقادر) کاتێک گەیشتە (بغداد)تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، ئیتر لەوێ دەستیکرد بەوانە خوێندن و تا ئەوکاتەی وەفاتی کرد هەر لە (بغداد) مایەوە، زیاتر لە حەفتا ساڵ لە (بغداد)ژیا.

لەو ماوەیەدا بارودۆخی (بغداد) تێکچووبوو، برسێتی و نەبوونی بڵاوبووەوە، (عبدالقادر)یش تووشی سەختی و ناڕەحەتییەکی زۆر بوو، بەڵام بەرگەی گرت، دەستی کرد بەئیشکردن، (عبدالقادر) جار هەبوو تەواو ماندوو دەبوو، بۆیە دەچوو بۆ دەرەوەی شار و سوجدەی دەبردو تا دەیتوانی نزای دەکرد خوا کاری بۆ ئاسان بکات، خواش نزاکەی وەردەگرت.

(عبدالقادر) لە (بغداد)تا توانی زانستی وەرگرت و ماوەی سی و سێ ساڵ وانەی دەخوێند تا بوو بە زانایەکی هەڵکەوتە، دوای ئەوەی ناوبانگی دەرکرد، ئیتر دەستی کرد بەوانە وتنەوە و سەدان خوێندکاری پێگەیاند.

(عبدالقادر) لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا دووچاری نەخۆشییەکی سەخت بوو.

کوڕەکەی وتی: باوکە گیان کوێی جەستەت ئازاری هەیە؟

ئەویش وتی: هەموو جەستەم ئازاری هەیە جگە لە دڵم، چونکە دڵم لە یادی خوادایە و ئازاری نییە، ئینجا وەسیەتی کرد بۆ کوڕەکەی وە وتی: کوڕی شیرینم لە خوا بترسە و جگە لە خوا ترست لە کەس نەبێت، تەنیا داوا لە خوا بکە و تەنیا پشت بەخوا ببەستە، هەر ئەویش بپەرستە و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیارمەدە.

دواجار لە درەنگانێکی شەودا و لە ساڵی ٥٦١ ی کۆچییدا لە (بغداد) کۆچی دوایی کرد و تا ئێستاش گۆڕەکەی لە (بغداد)ە، بەڵام کۆمەڵێک کەسی نەشارەزا ئێستا دەچن بۆسەر گۆڕەکەی و لێی دەپاڕێنەوە، ئەوەش تاوانە و حەرامە و شێخ (عبدالقادر) تا لە دونیادا بوو دژی ئەو جۆرە تاوان و گوناهە بوو.

**پرسیار:**

| |
|---|
| ١- (عبدالقادر) لە گوندەکەی خۆیان سەرقاڵی چی بوو؟ |
| ٢- کاتێک (عبدالقادر) ویستی بچێت بۆ (بغداد) دایکی چی پێوت؟ |
| ٣- بەسەرهاتی دزەکان چۆن بوو؟ |
| ٤- بۆچی (عبدالقادر) لە (بغداد) دەچووە دەرەوەی شار؟ |
| ٥- وەسیەتی (عبدالقادر) بۆ کوڕەکەی چی بوو؟ |

# أبو داود

ئەم کەسایەتیە گەورەیەیی ئێستا باسی دەکەین یەکێکە لە زاناکانی بواری فەرمـوودە، واتە کەسێک کە ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ کۆکردنەوە و نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوەش بەخششێکی خوایی بوو بۆ ئەو تا خزمەتی فەرموودە بکات، خەڵاتێکی خواییش بوو بۆ ئێمە تا فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بگەنە دەستمان.

ئەم زانا خۆشەویستە ناوی (سليمان بن الأشعث)، بەڵام (أبو داود) ناسراوە و خەڵکی ناوچەی (سجستان)ە.

(أبو داود) لە ساڵی دووسەد و دووی کۆچیدا لە دایکبووە، سەرەتای ژیانی منداڵی خۆی لە (بصرە) بەسەربرد، دواتریش چوو بۆ (بغداد) و ماوەیەک لەوێ مایەوە، ئیتر جارجارە دەچوو بۆ (بغداد)و دەگەڕایەوە بۆ (بصرە).

(أبو داود) هەر لە سەرەتاوە تامەزرۆی زانستی فەرموودە بوو تابچێتە خزمەت فەرموودەکانی سەروەری مرۆڤایەتی، لەوکاتەی ئەویشدا زانای بواری فەرموودە زۆربوون، بۆیە ئەوە دەرفەتێکی

چاک بوو بۆی، لەو پێناوەشدا ماندوێتی نەدەزانی، کەوتە گەڕان بەدوای فەرموودەکاندا و وڵات و وڵات دەگەڕا، بۆ وەرگرتنی فەرموودەکان چووە (خوراسان)، (مصر) و (شام) و (حجاز) و چەندین شوێنی تر. لەوێ دەچوویە خزمەت زاناکان و فەرموودەی لەوان وەردەگرت و دەینووسیەوە، توانی بچێتە خزمەتی دەیان مامۆستا و زانستی هەموویان کۆبکاتەوە و تۆماری بکات تا بوو بە زانایەکی ناودار و لە هەموو ناوچەکانی جیهانی ئیسلامییەوە خوێندکاران دەهاتنە خزمەتی و دەرسیان لە لا دەخوێند، خوێندکارەکانی (أبو داود) هەزاران کەس دەبوون.

(أبو داود) هێندە زانا و جێمتمانە بوو تەنانەت مامۆستاکانی خۆیشی گوێیان لێدەگرت، بۆنموونە یەکێک لە مامۆستاکانی کە ئیمامی (أحمد)ە فەرموودەی لە (أبو داود)ەوە دەبیست و دەینووسیەوە، هەروەها دوو زانای تری بواری فەرمووده خوێندکاری (أبو داود) بوون کە ئەوانیش بریتین لە (نیسائی) و (ترمذی).

جارێک یەکێک لە خواناسەکان بە ناوی (سهل بن عبدالله) هات بۆ لای (أبو داود)، داوای مۆڵەتی کرد و ئەو کەسەی دەرگاکەی کردەوە وتی: ئەی (أبو داود) (سهل) هاتووە بۆ لات، ئەویش چوو بەدەمیەوە و پێشوازیەکی گەرمی کرد و داینیشاند.

دوایی (سهل) وتی: ئەی (أبو داود) داواکاریەکم لێت هەیە.

ئەویش وتی: چییە؟

(سهل) وتی: دەبێت بەڵێنم پێبدەیت ئەگەر توانیت بیکەیت.

وتی: باشه.

(سهل) وتی: ئەو زمانەت کە فەرموودەی پێغەمبەری خوات (ﷺ) پێگێڕاوەتەوە بیهێنە با ماچی بکەم، (أبو داود)یش تازە بەڵێنی دابوو، بۆیە زمانی هێنایە دەرەوەو سەهلیش ماچی کرد.

پەندو وانە: دەبێت لەم دوو زانا خواناسەوە فێر بین ڕێز لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بگرین و ڕێزی ئەو کەسانەش بگرین کە لە خزمەتی فەرموودەی پێغەمبەردان (ﷺ)، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەرچی فەرمووە خوای گەورە فێری کردووە، هەروەها هەرکەس لە خزمەتی فەرموودەدا بێت خوای گەورە ڕێزداری دەکات و لای موسوڵمانان خۆشەویستی دەکات.

پیاوێکی خواناس هەبوو ناوی (أبوبکر) بوو، ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتکردنی (أبو داود)، جارێک لەگەڵ (أبو داود) لە *(بغداد)* بوون و نوێژی ئێوارەیان کرد، کەسێک لەتەقەی دەرگایدا، کەسێک بوو وتی: یەکێک لە سەرکردەکان داوای مۆڵەت دەکات تا بێتە ژوورەوە، (أبوبکر)یش هەواڵەکەی دا بە (أبو داود)، ئەویش مۆڵەتیدا و سەرکردەکە هاتە ژوورەوە و دانیشت.

(أبو داود) هات بۆ لای و وتی: ئەی سەرکردە خێرە لەم کاتەدا هاتویت؟

ئەویش وتی: لەبەر سێ شت هاتوم، یەکەمیان ئەوەیە بچیت بۆ (بصرە) بۆئەوەی خوێندکارانی هەموو جیهان بێن بۆ لات، دووەمیش ئەوەیە وانە بە کوڕەکەم بڵێیتەوە، سێیەمیش بەجیا و

بەتـــــایبەت وانە بە کـــــوڕەکەم بڵێیــــــتەوە نەوەک لەگەڵ خوێندکارەکانی تر. (أبو داود) وتـی: بۆ سێیەمیان ڕازی نیم، چونکە هەمـوو خەڵـک لە وەرگرتنـی زانستدا وەک یەک وان، بــۆیە لەو ڕۆژە بەدواوە کوڕەکـــانی ســـەرکردەکانیش دەچـــوون لەگەڵ خوێندکارەکانی تردا لای ئەبووداوود وانەیان دەخوێند.

دواجــار ئیمــامی (أبــو داود) هەر لە شــاری (بصــره) و لە ساڵی دووسەد و حەفتا و پێنجی کۆچیدا وەفـاتی کـرد و لای گۆڕەکەی (سفیان الثوری)دا ئەسپەردە کرا.

**پرسیار:**

١- (أبو داود) زیاتر لە چ بوارێکدا زانا بوو؟
٢- پەیوەندی نێوان (أبو داود) و مامۆستاکانی چۆن بوو؟
٣- بۆچی (سهل) زمانی (أبو داود)ی ماچ کرد؟
٤- داواکاریەکانی سەرکردەکە لە (أبو داود) چی بوون؟
٥- داوا لە خۆشەویستێکت بکە فەرموودەیەکت بۆ بخوێنێتەوە لە کتێبەکەی ئەبووداوودا.

# ابن حجر

ئیمامی (ابن حجر) ناوی (شهاب الدین أبو الفضل أحمد بن علي) و بە بنەڕەت خەڵکی (عسقلان)، بەڵام لە (مصر) لە دایکبووەو و هەر لەوێ گەورە بووە و لەوێش وەفاتی کردووە، زیاتر بە (ابن حجر) ناسراوە، چونکە ئەوە نازناوی بنەماڵەکەی بووە.

(ابن حجر) لە بنەماڵەیەکی پڕ لە زانست و خواناسدا لە دایکبوو، هەم باوکی و هەم مامیشی زانا بوون و کەسوکارەکەی تری چەندین زانای گەورەیان تێدابوو، باوکی جگە لە زانایییەکەی ناسرابوو بەزۆری پەرستش، حەجی زۆری دەکرد.

(ابن حجر) لە مانگی شەعبانی ساڵی حەوت سەد و حەفتا و سێی کۆچیدا لە (مصر) لە دایکبووە، (ابن حجر) خاوەنی دایک و باوکێکی دەوڵەمەند بوو، چونکە باوکی لە (مصر) بازرگانی دەکرد.

هێشتا (ابن حجر) تەمەنی نەگەیشتبووە پێنج ساڵ کە باوکی

وەفاتی کرد، ئەمەش بۆ (ابن حجر) سەخت بوو، چونکە نازی باوکایەتی لە دەستدا، بەڵام باوکی سامانێکی زۆری بۆ جێهیشت، ئەمەش دەرفەت بوو بۆ (ابن حجر) تا سەرقاڵی کاری تر نەبێت و زۆربەی کاتی ژیانی تایبەت بکات بۆ زانستخوازی.

دوای مردنی باوکی یەکێک لە کەسە نزیکەکانی باوکی سەرپەرشتی (احمد)ی گرتە ئەستۆ، خێرا ئەوی خستە قوتابخانە، ئەویش بە جوانی وانەی دەخوێند، گرنگییەکی زۆریشی دەدا بە قورئانی پیرۆز و توانی تا تەمەنی دوانزە ساڵی هەموو قورئانی پیرۆز لەبەربکات، لە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزیشدا زۆر بەتوانا بوو ڕۆژانە چارەکە جوزئی قورئانی پیرۆزی لە بەردەکرد.

دوای ئەوە لە تەمەنی دوانزە ساڵییدا بڕیاریدا بچێت بەرەو (مەکة)، خۆی گەیاندە ئەوێ و لەوێ ماوەی ساڵێک مایەوە و لای مامۆستایەکی زانای ئەوێ زانستی فەرموودەی خوێند و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لە بەردەکرد، هەر لەو ماوەیەدا و لە تەمەنی دوانزە ساڵییدا لە کاتی نوێژی تەراویحدا لە (مکة) پێش نوێژی دەکرد بۆ موسوڵمانان.

دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ (مصر)، لەوێ دەستی کرد بە وەرگرتنی زانست و لە خزمەت چەند مامۆستایەکی گەورەدا وانەی خوێند.

(ابن حجر) بەوەش وازی نەهێنا، بەڵکو لە پێناو وەرگرتنی

زانستدا ڕوویکردە وڵاتانی تری جیهانی ئیسلامی، چوویە هەریەک لە وڵاتی (شام) ، (حجاز) و (یمن)، کاتێک چوو بۆ (شام) ماوەیەک لە (فلسطين) مایەوە و لەوێ زانستی لە زانا گەورەکان وەردەگرت.

(ابن حجر) لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا ژیانی هاوسەردایی پێکهێنا، گرنگییەکی زۆری دا بەپەروەردە و فێرکردنی ژنەکەی و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) پێدەوتەوە، خوای گەورە لەم ژنەی پێنج کچی پێبەخشی.

(ابن حجر) دوای ئەوەی زانستێکی زۆری وەرگرت، ئینجا دەستیکرد بە وانە وتنەوە و خوێندکارێکی زۆر لە خزمەتیدا دادەنیشتن و فێری زانست دەبوون.

(ابن حجر) کەسێکی بێدەنگ بوو، تاپێویست نەبوایە قسەی نەدەکرد، ئازار و نارەحەتی بۆ هیچ کەسێک نەبوو، تا دەیتوانی لە دەرەوەو لە شوێنان سەلامی دەکرد لە خەڵکی، بەرانبەر بەو کەسانەش چاکەی دەکرد کە ئەوان خراپەیان بەرانبەر کردبوو.

جارێک (ابن حجر) چوو وانە بڵێتەوە، کەسێک کە ڕقی لە (ابن حجر) بوو لەولاوە قسەی ناشیرینی پێدەوت، (ابن حجر) وتی پەلە مەکەن با هەموو قسەکانی بڵێت و وازبهێنێت یان بێزار بێت و بڕوات، ئەوەش ڕەوشت بەرزی ئەم زانایە نیشان دەدات.

(ابن حجر) گرنگیەکی زۆری دەدا بە شەونوێژ و پەرستشەکانی دی، تەنانەت لە کاتی سەفەر و گەشتکردنیشدا

وازی نەدەهێنا لە شەونوێژ کردن، هەروەها گرنگییەکی زۆری دەدا بە قورئان خوێندن.

ئیمامی (ابن حجر) هاودەم بەوانە وتنەوەکانی، توانی نووسینێکی زۆر پێشکەش بە موسوڵمانان بکات، تا ئەمڕۆش نووسینەکانی ئەو زانا خواناسە ماونەتەوە و ئێمەی موسوڵمان سوودیان لێوەردەگرین، نووسینەکانیشی زۆر بەوردی و جوانی دەنووسی، تەنانەت بۆ نووسینی یەکێک لە کتێبەکانی ماوەی بیست و پێنج ساڵ خەریک بوو ئینجا تەواو بوو، ئەویش کتێبی (فتح الباري) بوو، بەڵام ئەو کتێبە ئەوەندە بەهێز بوو سەرکردەی وڵاتانی تر داوایان لە سەرۆکی وڵاتەکەی ئیمامی (ابن حجر) دەکرد ئەو کتێبەیان بۆ بنێرێت.

دواجار ئیمامی (ابن حجر) لە ساڵی ٨٥٢ ی کۆچیدا وەفاتی کرد و خەڵکێکی زۆر ئامادەی ئەسپەردەکردنی تەرمەکەی بوون، تەنانەت سەرکردەی موسوڵمانانیش ئامادە بوو.

**پرسیار:**

١- بنەماڵەی (ابن حجر) چۆن بنەماڵەیەک بوون؟

٢- (ابن حجر) دوای مردنی باوکی چی کرد؟

٣- بۆچی (ابن حجر) وڵاتە و وڵات دەگەڕا؟

٤- بەسەرهاتی قسەوتن بە (ابن حجر) چۆن بوو؟

٥- سەرقاڵبوونی (ابن حجر) بە نووسین باس بکە.

## إمام ذهبی

یەکێک لە زانا و پیاوە هەڵکەوتەکانی ناو مێژووی موسوڵمانان کە بووەتە جێگەی شانازی هەموومان (إمام ذهبی)ە، ئەو پیاوەی زیاتر لە سەد بەرگ نووسینی هەیە، تا ئەمڕۆش موسوڵمانان بۆ زانیاری و زانستەکەی دەگەڕێنەوە سەر نووسینەکانی.

(إمام ذهبی) لە بنەڕەتدا ناوی (محمد ابن احمد)ە، سەر بە نەتەوەی تورکمانەکانە، ئەوەش فەزڵێکی خوایە کە بەهۆی ئیسلامەوە لە هەموو نەتەوەیەکی جیاواز کەسانی زانا و خواناس و سەرکردە دەرکەوتوون.

زەهەبی لە شاری (دمشق) لە دایکبووە، هەر لەوێیش گەورە بوو، باپیرە گەوری زەهەبی کەناوی (قایماز) بوو پیاوێکی زۆر خواناس بوو، نزای وەردەگیرا، داوای لە خوا کرد ئەو کاتەی دەمرێت شەوی هەینی بێت، خواش نزاکەی گیرا کرد و (قایماز) لە شەوی هەینیدا کۆچی دوایی کرد، بۆیە بنەماڵەکەی زەهەبی هەر لە بنەڕەتەوە خواناس و ڕوو لە دین

بوون.

پرسیار: (احمد)ی باوکی چۆن بوو؟

وەڵام: (احمد)ی باوکیشی پیاوێکی ئیماندار بوو، سەرقاڵی ئیشی زێڕ بوو، بۆیە بەزەهەبی ناسراو ئەو نازناوەش بۆ (محمد)ی کوڕیشی مایەوە، (احمد)ی باوکی هاودەم بەکاری زەڕەنگەری سەرقاڵی وەرگرتنی زانست بوو، شەونوێژ و پەرستشیشی زۆر بوو، بەهۆی کارەکەشیەوە پارە و سامانێکی زۆری دەست دەکەوت و لە ڕێی خوادا خەرجی دەکرد و خێری زۆری پێدەکرد، ئیتر بەهۆی بەخشندەیی و خواناسی و زانایەکەیەوە لای خەڵکی (دمشق) زۆر خۆشەویست بوو.

هەروەها دایک و خاڵ و پووری زەهەبی زۆر خواناس بوون، تەنانەت زەهەبی لە خاڵ و پووریەوە زانستی وەردەگرت، ئیتر هەم خۆشەویستی زۆری هەبوو بۆیان و هەم وەک مامۆستاش تەماشای دەکردن.

زەهەبی لە ساڵی ٦٧٣ ی کۆچیدا لە دایکبوو، هەر کە کەمێک گەورە بوو بەجارێ دایک و باوک و خاڵ و پوور و دەوروبەرە نزیکەکانی کەوتنە پەروەردەکردنی زەهەبی، لە لایەکەوە نازیان دەکێشا و خزمەتیان دەکرد، لە لایەکی ترەوە هەم پەروەردەیان دەکرد و ڕەوشتی جوانیان نیشان دەدا، هەم

زانست و زانیاریان پێدەبەخشی، ئیتر هێندە زانستیان لاخۆشەویست کرد کە (ذهبی) تەواو تامەزرۆی کۆڕی زانایان بوو، زۆربەی کاتەکانی دەچوو لە کۆڕی زانایاندا دادەنیشت، بەتایبەت مامۆستا و زانایانی بواری فەرموودە.

(ذهبی) ویستی بچێت بۆ وڵاتانی تر تا لەوێیش زانست وەربگرێت، بەڵام باوکی ڕازی نەبوو بچێت و پێیوت کوڕەکەم لێرە زانای زۆر هەن، هەر لێرە لای خۆمان بمێنەرەوە و زانست وەربگرە، ئەویش گوێڕایەڵی قسەکەی باوکی بوون چونکە دەیزانی گوێڕایەڵی دایک و باوک ئەرکی سەرشانی موسوڵمانە، بەڵام دواتر کە تەمەنی گەیشتە بیست ساڵان ئیتر باوکی ڕێگەی پێدا بچێت، ئەویش بەگەرم وگوڕی کەوتە گەڕان بەشوێن زانایاندا و لەو پێناوەدا دەیان شاری دوور لە یەک گەڕا و زانستێکی زۆری وەرگرت.

(ذهبی) سەرەتا گرنگییەکی زۆری دەدا بەفێربوونی قورئانی پیرۆز و جوان خوێندنەوەی و واتا و تێگەیشتنی قورئان و هەموو قورئانیشی لەبەرکرد، دوای ئەوە کەوتە گرنگیدان بەزانستی فەرموودە و لەو بوارەشدا تاتوانی زانستی وەرگرت و چی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەبوو لەبەری کرد، دواتر (ذهبی) حەزی بە بواری مێژوو کرد و هەوڵیدا هەر لە سەرەتاوە

تـا سـەردەمی خـۆی بەوردی مێـژوو بنووسـێتەوە، بەتـایبەت گرنگیـدا بەمێـژووی ئیسـلامی، بەدەیـان بەرگـی لە بـواری مێژووی ئیسلامییدا نووسی، هەروەها گرنگییەکی زۆری دا بە بواری فیقهی ئیسلامی و لایەنی ئەدەب و شیعر.

**پەندو وانە:**

پێویستە ئێمەش شوێنپێی زانایانمان بگرینەبەر و وەک ئەوان زانست وەربگرین، هەروەها ئێمەش وەک ئیمامی زەهەبی و زانایانی تر سەرەتا و پێش هەموو شتێک گرنگی بدەین بە فێربوونی قورئانی پیرۆز، دواتر گرنگی بدەین بە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، دواتر هەر زانستێکی تری پێویست وەربگرین بۆ ئەوەی بە دروستی لە شتەکان تێبگەین.

دوای ماوەیەک(ذهبی) ژنی هێنا و ژنەکەشی زۆر خواناس و چاک بوو، خوای گەورە سێ منداڵی پێبەخشین، بەڵام تەنیا هەشت ساڵ بەسەر ژیانی هاوسەرییاندا تێپەڕ ببوو کە ژنەکەی وەفاتی کرد، ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی خوایی بوو، (ذهبی) لەو تاقیکردنەوەدا سەرکەوتوو بوو و خۆڕاگر بوو و بە قەدەری خوا ڕازی بوو.

(ذهبی) شوێنپێی باوکی هەڵگرت و وەک ئەو منداڵەکانی

خۆی لەسەر زانست و خواناسی پەروەردە کرد و هەرکام لە منداڵەکانیشی دواتر بوون بە زانای گەورە.

ئیتر (ذهبی) هەموو ماوەی ژیانی خۆیدا بە گەیاندنی پەیامی خوا و بە گوفتار و کردار و نووسین هەوڵیدەدا خەڵکی لە ئیسلام تێبگەیەنێت و چی زانستی پێیە بیبەخشێت، زیاتر لە سەد بەرگ کتێبی نووسی، هێندە سەرقاڵی نووسین بوو تا لە کۆتاییدا جەستەی تەواو لاواز بوو، چاوی کز بوو، لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا بینایی لە دەستدا و چەند ساڵێ بە نابینایی ژیانی بەسەر برد، بەو حاڵەوە وەڵامی پرسیاری خەڵکی دەدایەوە و فەتوای بۆ دەدان، دواجار لە ساڵی ٧٤٨ ی کۆچی و هەر لە شاری (دمشق)دا کۆچی دوایی کرد و زانایانێکی زۆر و خەڵکێکی بێشومار نوێژیان لەسەرکرد.

**پرسیار:**

| |
|---|
| ١- (ذهبی) سەر بە چ نەتەوەیەک بوو؟ |
| ٢- باپیرەی (ذهبی) بە چی ناسرابوو؟ |
| ٣- باوکی (ذهبی) چۆن بوو؟ |
| ٤- بۆچی (ذهبی) سەرەتا گەشتی نەکرد بۆ ناوچە و وڵاتەکانی تر؟ |
| ٥- (ذهبی) سەرەتا گرنگی بە چ زانستێک دا؟ |
| ٦- (ذهبی) لە کۆتاییەکانی ژیانیدا تووشی چی بوو؟ |
| ٧- دەتوانیت ژیانی (إمام ذهبی) بۆ کەسێکی خۆشەویستت باس بکەیت؟ |

## ئیمامی بخاری

ئەم زانا و کەسایەتییەی ئێستا باسی دەکەین، یەکێکە لە دیارترین زانا گەورە و ئازیز و خۆشەویستەکان، گەورەترین زانای بواری فەرموودە کە بەدروستترین شێوە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) نووسیوەتەوە و لە هەموو زاناکانی تر جوانتر فەرموودەکانی نووسیوەتەوە.

ئیمامی (بخاری) ناوی (محمد ابن اسماعیل)ە و بەڕەچەڵەک فارسە، باپیرە گەورەی فارسێکی ئاگرپەرست بوو، هەر بەئاگرپەرستی مرد، بەڵام دواتر خوای گەورە ئیسلامی گەیاند بەو بنەماڵەیە، باوکی (بخاری) یەکێک بوو لە پیاوە خواناس و زۆر ئیماندارەکان، هەروەها زانایەکی گەورە بوو کە فەرموودەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەگێڕایەوە، هێندە پاک و خواناس بوو نەیدەهێشت پاروویەک نانی حەرام بچێتە ماڵەکەیەوە، لە کاتی سەرەمەرگیدا وتی: "تاکە درهەمێکیش پارەی حەرام نەهاتۆتە

ماڵەوە، تەنانەت ئەوەش حەرام نەبوبێت، بەڵام گومانم هەبووبێت حەرامە نەمهێشتووە بێتە ماڵەوە."

بەڵێ، لە مێژوودا فارسەکان زانای زۆر و خواناسیان پێشکەش بە موسوڵمانان کردووە، بەتایبەت زانایانی بواری فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وەک ئیمامی (ابن منده) کە پێشتر باسمان کرد، ئەوەتا ئیمامی (بخاری)یش فارسە و گەورەترین زانای بواری فەرموودەیە.

باوکی (بخاری) چوو بۆ شاری (بخارا) و لەوێ ژیا، هەر لەوێ لە ساڵی دووسەد و نەوەد و چواری کۆچی و لە دوای نوێژی هەینی لە دایکبووە.

(بخاری) هێشتا منداڵ بوو کە باوکی کۆچی دوایی کرد، باوکی سامانێکی زۆری دوای خۆی جێهێشت و ئەوە هۆکار بوو تا (بخاری) تووشی هەژاری نەبێت، ئیتر دایکی هەوڵیدا هەم بۆی ببێتە دایک و هەم ببێتە باوک، گرنگییەکی زۆری پێدا، جا (بخاری) بە منداڵی بینایی لە دەستدا، دایکی هێندە نزای خێری بۆ کرد کە لەبەر نزاکانی دایکی، خوای گەورە بینایی بۆ گێڕایەوە.

(بخاری) هەر لە سەرەتاوە خووی دایە بواری فەرموودە و ژمارەیەکی زۆر فەرموودەی لەبەرکرد، هێشتا تەمەنی

نەگەیشتبووە دە ساڵ کە ژمارەیەکی زۆر فەرموودەی لەبەرکرد، دوای ئەوە دەچووە خزمەت زانایانی گەورە و لە خزمەتیاندا زانستیان وەرگرت، تەمەنی نەگەیشتبووە شانزە ساڵ کە چەندین کتێبی بەتەواوەتی لە بەرکردبوو.

(بخاری) لەلایەن پەروەدگارەوە توانای لە بەرکردنی پێبەخشرابوو، کاتێک لەگەڵ هاوڕێکانی دەچوو بۆ وەرگرتنی فەرموودە، ئەوان دەیاننوسیەوە، بەڵام (بخاری) یەکسەر لە بەری دەکرد.

دواتر هاوڕێکانی وتیان: خۆ تۆ هیچت نەنووسیوەتەوە.

ئەویش وتی: هەموویم لە بەرکردووە. کاتێک پرسیاریان لێکرد هەموو فەرموودەکانی بەدروستی دووبارە دەکردەوە و توانیبووی هەزاران فەرموودە لە بەربکات.

دوای تەمەنی شانزە ساڵی، ئیتر(بخاری) بڕیاریدا لە پێناو وەرگرتنی زانستدا بچێتە دەرەوەی وڵاتی خۆی، سەرەتاش چوو بۆ حەج، هاودەم بە (بخاری) (احمد)ی برای و دایکیشی چوون بۆ حەج،(بخاری) لە حەجەوە نەگەڕایەوە و لەوێ مایەوە و کەوتە وەرگرتنی زانست، هەر لەوێ چەند کتێبێکی نووسی و سەرەتای کتێبە بەناوبانگەکەی دەست پێکرد کە ئەویش ناسراوە بە (صحیحی بخاری). ئینجا لەوێوە چوو بۆ چەندین ناوچەی

تری جیهانی ئیسلامی و فەرموودەکان پێغەمبەری خوای (ﷺ) کۆدەکردەوە، هەریەک لە وڵاتی (عراق)، (شام)، (مصر)، (ئیران) و چەندین شوێنی تر گەڕا تا چی فەرموودە هەیە هەموویان کۆبکاتەوە.

ئیمامی (بخاری) چەندین خوێندکاری هەبوون کە زانستی فێر دەکردن و فەرموودەی بۆ دەگێڕانەوە، لەوانەش پێشەوا و زانا گەورەکانی بواری فەرموودە (امام ترمذی، امام نەیسائی، امام مسلم).

جارێک ژمارەیەکی زۆری زانایانی فەرمووده لە شاری (سمرقند) کۆبوونەوە و ویستیان تاقیکردنەوەیەک بکەن بە (بخاری)، هاتن ژمارەیەکی زۆر فەرموودەیان هێنا و تێکەڵیان کردن تابزانن بوخاری دەتوانێت هەڵەکان ڕاست بکاتەوە؟ (بخاری) توانی هەموو فەرموودەکان وەک خۆی بنووسێتەوە و تێکەڵکردنەکە ڕاست بکاتەوە.

جارێکی تر لە (بغداد) زانایان کۆبوونەوە تا (بخاری) تاقیبکەنەوە و سەد فەرموودەیان هێنا و تەواو تێکەڵیان کرد،(بخاری) توانی سەرکەوتووانە هەموویان جیا بکاتەوە و بەجوانی فەرموودەکان بنووسێتەوە.

(بخاری) بەشێکی زۆری ژیانی خۆی دانابوو بۆ

خوێندنەوەی قورئان و ڕامان لە ئایەتە پیرۆزەکانی، بەتایبەت دوای نوێژی بەیانیان دەستی دەکرد بەقورئان خوێندنەوە.

دواجار (بخاری) بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ (بوخارا)، کاتێک خەڵکی هەواڵیان بیست ئیمامی (بخاری) دەگەڕێتەوە، هەموو کۆبوونەوە و چوون بۆ پێشوازی لێکردنی، ئاهەنگێکی گەورەیان بۆ گێڕا و لە مزگەوت کۆبوونەوە تا گوێی بۆ بگرن، ئەویش ماوەیەکی زۆر فەرموودەی بۆ دەگێڕانەوە.

پاش ماوەیەک لەسەر داوای خەڵکی (سمرقند) کەوتەڕێ بۆ ئەو شارە، بەڵام لە نیوەی ڕێدا نەخۆش کەوت، ماوەیەک لەوێ مایەوە و دواتر کەویستی بچێت بۆ (سمرقند)، هەستایەوە سەرپێ و چەند هەنگاوێک ڕۆشت، نەیتوانی بگاتە لای ئەسپەکەی، هاوەڵەکانی دایاننیشاند، ئیمامی (بخاری) هەندێک نزای کرد، لە جێگەدا کەوت و عارەقێکی زۆری دەکرد، دواجار لە کاتی نوێژی عیشادا کۆچی دوایی کرد، تەمەنیشی شەست و دوو ساڵ بوو، تەرمەکەیان هێشتەوە تا بەیانی و هەتا دوای نوێژی نیوەڕۆ ئینجا ئەسپەردەیان کرد.

**پرسیار:**

١- ئیمامی (بخاری) سەر بە چ نەتەوەیەک بوو و لە کوێ لە دایکبووە؟
٢- باوکی (بخاری) لە سەرەمەرگیدا چی وت؟
٣- ژیانی منداڵی (بخاری) چۆن بوو؟
٤- باسی تاقیکردنەوەکانی (بخاری) بکە.
٥- (بخاری) تا چەند گرنگیدەدا بەقورئانی پیرۆز؟

# ئیمامی غزالی

یەکێک لە پێشەوا و زانا گەورەکانی موسوڵمانان ئیمامی (غزالی) بوو، ئەو پیاوە خواناسەی کە توانی هەم بەرپەرچی گومڕایی و نەزانی فەیلەسوفەکانی خۆرئاوا بداتەوە و هەم بەشێک لە هەڵە و لادانی موسوڵمانان ڕاست بکاتەوە، بۆیە زۆر گرنگە منداڵ و گەنجی موسوڵمان بەچاکی ئەو پیاوە زانایە بناسن.

ئیمامی (غزالی) ناوی (محمد) بوو، باوکیشی هەر ناوی (محمد) بوو، (محمد)ی باوکی سەرقاڵی ئیش و کار بوو، (غزالی) برایەکیشی هەبوو بەناوی (احمد).

ئیمامی (غزالی) لە ساڵی ٤٥٠ ی کۆچی لە شارێک بەناوی شاری (طوس) لە دایکبوو، ئەو شارەش دەکەوێتە ئێرانەوە، ئەمڕۆ بەو شارە دەوترێت (مشهەد).

کاتێک باوکی (غزالی) لە مردن نزیک بووەوە، وەسییەتی بۆ یەکێک لە زاناکان کرد، تکای لێکرد ئاگای لە هەریەک لە (غزالی) و (احمد)ی برای بێت و زانستێکی چاکیان

فێریکات، هەرچی سامانێکیشی جێهێشتووە لەو ڕێگەیەدا بۆیان خەرج بکات، دوای ئەوە باوکیان وەفاتی کرد، ئیتر ئەو زانایە کەوتە پەروەردە و فێرکردنی(غزالی) و (احمد)ی برای، زۆری نەخایاند ئەو پارە و سامانەی باوکیان تەواو بوو، زانا صۆفیە موسوڵمانەکەش توانای نەبوو خەرجی ئەو دوو منداڵە بکێشێت، بۆیە ڕۆژێک هەردووکیانی بانگ کرد و وتی ڕۆڵە شیرینەکانم تا ئێستا لە پارە و سامانی باوکتان خەرجیم دەکێشان، ئێستا وا پارەکەی تەواو بووە، جا منیش کەسێکی هەژارم و هیچ سامانێکم نییە تابتوانم خەرجیتان بکێشم، بۆیە پێم باشە هەردووکتان بچنە قوتابخانەیەک و لەوێ وانە بخوێنن، لەوێ هەم نان و خواردن و جلوبەرگتان دابین دەکەن و هەم زانیستیشتان فێر دەکەن.

پرسیار: ئەو جۆرە قوتابخانانە کەی هەبوون؟

وەڵام: لەو سەردەمەدا دەسەڵاتی موسوڵمانان قوتابخانەی دروست کردبوو، تا منداڵان و گەنجان تیایدا وانە بخوێنن، هەروەها بۆ ئەوەی بێخەمبن و بتوانن جوان زانست وەربگرن هەموو خەرجییەکی قوتابیانی دەگرتە ئەستۆی خۆی، ئەوەش سەروەرییەکی موسوڵمانان بوو کە هێندە گرنگییان دەدا بە زانست.

(غزالی) و (احمد)ی برای قسەی مامۆستاکەیان وەرگرت و چوون بۆ قوتابخانەیەک و هەر لە سەرەتاوە لە شارەکەی خۆیان

زانستیان وەرگرت، دواتر (غزالی) بۆ وەرگرتنی زانستی زیاتر چوو بۆ شاری (جورجان) و لەوێیش زانستی وەرگرت.

پرسیار: ئایا (غزالی) لەو سەفەرەیدا تووشی ناڕەحەتی بوو؟

وەڵام: (غزالی) لەو سەفەرەیدا ناڕەحەتییەکی هاتە ڕێ، ئەوەبوو لە نیوەی ڕێدا ژمارەیەک چەتە و ڕێگر هاتنە بەردەمیان و هەرچییان پێبوو لێیان سەندن، (غزالی) وازی نەهێنا و کەوتە شوێن چەتەکان و دەیوت هەر دەبێت شتەکانم پێبدەنەوە، یەکێک لەوانیش دەیوت بگەڕێرەوە با نەتکوژم.

(غزالی) وتی: لەبەر خاتری خوا ئەو شتانەم بدەرەوە.

چەتەکە وتی: ئەو شتانەت چین هێندە لات گرنگن؟ ئەویش وتی: چەند کتێبێکن، چەندین شار و شوێنم کردووە تا ئەو زانستەم کۆکردووەتەوە، کابرا پێکەنی و وتی جا ئەوە چ جۆرە زانستێکە ئێمە بتوانین بە ئاسانی لێت بدزین و تۆیش نەتوانیت لای خۆت بیهێڵیتەوە، دواتر فەرمانی کرد کتێبەکانیان پێدایەوە.

ئەم ڕووداوە بوو بەوانەیەکی گەورە بۆ (غزالی)، ئیتر هەر زانستێکی وەریگرتایە و بینووسیایە، هێندە جوان دەیخوێندەوە کە ئەگەر کتێبەکەی بفەوتایە یان بدزرایە هەر زانستەکەی لەبیر دەما و پەکی نەدەکەوت، دەی دەبێت ئێمەش وەک ئیمامی (غزالی) لەم بەسەرهاتەوە پەند وەربگرین و بەجۆرێک زانیاری وەربگرین وە لێی تێبگەین کە ئەگەریش کتێبەکەمان لە دەست چوو هەر زانستەکە لە بیر و هۆشماندا بمێنێتەوە.

دواجار ئیمامی (غزالی) چووە خزمەتی یەکێک لە زانا گەورەکانی موسوڵمانان بەناوی ئیمامی (جوینی)، لە خزمەتییدا زانستی وەردەگرت و هاوکات وانەشی دەوتەوە بە خوێندکارەکانی خۆی تا ئەوکاتەی ئیمامی (جوینی) وەفاتی کرد، ئیتر دوای ئەوە (غزالی) چوو بۆ لای سەرکردەیەکی زانا و هەڵکەوتەی موسوڵمانان کە وەزیر (نظام الملك) بوو، ئەم سەرکردەیە زۆر ڕێزی زانایانی دەگرت و خزمەتی دەکردن و خوێندنگەی زۆری دەکردەوە تا زانست لە ناو موسوڵماناندا بڵاوبکرێتەوە.

(غزالی) لەوێ چاوی کەوت بەسەدان زانای تر و ڕۆژانە لەسەر بابەتە گرنگەکان گفتگۆیان دەکرد و ئاڵوگۆڕی زانیارییان دەکرد، دواتر لە خوێندنگەی نیزامیە لە (بغداد) کەوتە وانە وتنەوە و توانی خوێندکارێکی زۆر پێبگەیەنێت، لە کاتی وانە وتنەوەکانیدا نزیکەی چوارسەد زاناش دادەنیشتن و گوێیان لێدەگرت.

کاتێکیش دەچوویەوە بۆ ماڵەوە، سەرقاڵ دەبوو بە نووسینی کتێبەوە و چەندین کتێبی نووسی کە تا ئەمڕۆش نووسینەکانی ماونەتەوە، هاوکات نەیدەوت من زانستم زۆرە و ئیتر پێویست ناکات زانست وەربگرم، بەڵکو بەردەوام زانستی وەردەگرت، چ بە خوێندنەوەی کتێب، چ بەوەرگرتنی زانیاری زاناکانی دەوروبەری.

دواتر (غزالی) ویستی ماوەیەک بەتەنیا بێت و کەس نەیناسێت، بۆیە (بغداد)ی جێهێشت و چوو بۆ وڵاتی (شام) و

لەوێ هەر جارە و لە شارێک دەمایەوە، ماوەیەکیش لە (قودس) مایەوە، لەو ماوەدا هەوڵیدەدا دەروونی خۆی پەروەردە بکات و خواناسی زیاد بکات و زۆربەی کاتی سەرقاڵی پەرستش بوو.

ماوەی دە ساڵ لە (شام) مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ شوێنی لە دایکبوونی خۆی کە شاری (طوس) بوو، ساڵێک لەوێ مایەوە، بەڵام زانایان زۆر تکایان لێکرد تا واز لە کەنارگرتن بهێنێت و زانست فێری خەڵک بکات، بۆیە ئەویش بڕیاریدا بچێت بۆ شاری (نیشابور) و لەوێ وانە بڵێتەوە.

بەڵام لەوێش دڵی ئارامی نەگرت و گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی و لە پاڵ ماڵی خۆیدا کەوتە وانە وتنەوە و قورئان خوێندن، خوێندنەوە و لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد، تەنانەت ئەو کاتەی وەفاتی کرد کتێبی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بەدەستەوە بوو.

دواجار ئیمامی (غزالی) لە ڕۆژی دووشەممە و لە ساڵی ٥٠٥ی کۆچیدا لە شاری لە دایکبوونەکەی خۆیدا وەفاتی کرد.

**پرسیار:**

| |
|---|
| ١- ئیمامی (غزالی) خەڵکی چ شارێک بوو؟ |
| ٢- بۆچی (غزالی) و (احمد)ی برایی مامۆستاکەی خۆیان جێهێشت؟ |
| ٣- (نظام الملك) کێ بوو؟ |
| ٤- بۆچی (غزالی) چوو بۆ (شام)؟ |
| ٥- کاتێک ئیمامی (غزالی) وەفاتی کرد سەرقاڵی چی بوو؟ |

## ئیمامی الأشعری

ئەم زانا خۆشەویستەی ئێستا باسی دەکەین، لە مێژووی موسڵماناندا ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینی، ئەویش بریتی بوو لە وەڵامدانەوەی هەڵە و لادانی بەشێک لەو کەسانەی بە هەڵە لە ئیسلام تێگەیشتبوون و دەیانویست بە هەڵەش خەڵک فێری ئیسلام بکەن.

ئیمامی (الأشعری) لە بنەڕەتدا ناوی (علی ابن اسماعیل) بوو، باپیرە گەورەی دەچوویەوە سەر یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە (ابو موسی (الأشعری)) بوو.

(اسماعیل)ی باوکی یەکێک بوو لە زانا گەورەکانی ناو موسڵمانان و زۆربەی کاتی خۆی دابوو بە بواری فەرموودە، زۆرێک لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەبەرکردبوو، جا کاتێک سەرەمەرگی نزیک بوویەوە، هێشتا (علی) کوڕی بچووک بوو، بۆیە وەسییەتی کرد بۆ یەکێک لە زاناکانی بواری فەرموودە تا لە دوای خۆی ئاگای لە (علی) کوڕی بێت.

لە ساڵی ٢٦٠ ی کۆچیدا ئیمامی (الأشعری) لە شاری (بصره) لە دایکبوو، چونکە دایک و باوکی لەوێ دەژیان.

پاش ئەوەی باوکی وەفاتی کرد، یەکێک لە زانا گەورەکانی بواری فەرمووده سەرپەرشتی (علی) کرد، ئەویش هەر لە سەرەتاوە دەستی کرد بە وەرگرتنی زانست، بۆ ئەوەش تەنها لە شاری (بصره) نەمایەوە، بەڵکو بریاری دا بچێت بۆ (بغداد) کە پایتەختی ئەوکاتی موسڵمانان بوو، لەوێ لە خزمەتی هەندێک لە زانایاندا زانستی وەرگرت.

بەڵام (علی) سەرەتا کەوتە داوی کەسانێکەوە کە بە هەڵە لە ئیسلام تێگەیشتبوون، ئەوانیش تاقمێک بوون پێیان دەوترا موعتەزیلە.

پرسیار: موعتەزیلەکان چۆن لە ئیسلام تێگەیشتبوون؟

وەڵام: موعتەزیلەکان وا لە ئیسلام تێگەیشتبوون کە عەقڵی مرۆڤ لە پێش هەموو شتێکەوەیە و هەرچیەک لە ئیسلامدا هاتبێت و لەگەڵ عەقڵدا نەگونجێت، دەبێت کاری پێ نەکەین، هەروەها ڕەخنەیان لە ژمارەیەکی زۆری فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگرت.

(علی) سەرەتا کەوتە شوێن ئەوان، وایزانی ئەو تاقمە ڕاست و حەقن، ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەواندا بوو، پشتیگری بیروبۆچوونی ئەوانی دەکرد، تا دواتر بە زۆر خوێندنەوەی قورئانی

پیــرۆز و فەرموودەکــانی پێغەمــبەر (ﷺ) و بیرکــردنەوە لە شتەکان و خوێندنەوەی نووسینە بەهێزەکانی زانایان، بە جوانی لە شتەکان تێگەیشت.

شەوێک ئیمامی (الأشعری) دەستنوێژی گرت و دوو ڕکات نوێژی کرد، تاوەکو توانی نزای کرد و لە خوا پاڕایەوە، ئینجا بە دەستنوێژەوە خەوت، شەو خەونی بینی بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، ســکاڵای خــۆی لای پێغەمــبەر (ﷺ) کــرد، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێنمایی کرد و فەرمووی (دەست بگرە بە فەرموودەکانی منەوە) ئیتر (الأشعری)کە لە خەو ڕاچڵەکی، دەســتی کــرد بە گرنگــی دان بە قورئــان و فەرموودەکــانی پێغەمبەر (ﷺ).

ئینجا ئیمامی (الأشعری)کە زانی ئەو کەسانەی پێشتر هاوڕێی بوون لە چ هەڵەیەکدان، هەوڵی دا بە شێوەیەکی دڵسۆزانە ڕێی ڕاستیان نیشان بدات، بۆ ئەوەش ڕۆژانە قسەی بۆ دەکردن و چەندین نووسینی لەو بوارەدا پێشکەش کرد، هەروەها دەستی کرد بە وانەوتنەوە و بە سەدان خوێندکاری پێگەیاند و بە جوانی پەیامی ئیسلامی فێرکردن.

ئیمامی (الأشعری) زۆر جار لەگەڵ ئەو کەسانە دادەنیشت کە بە هەڵە لە ئیسلام تێگەیشتبوون و قسەی بۆ دەکردن و رای

ئەوانــی دەبیســت و روونکــردنەوەی بــۆ دەدان و چەنــدین کەس لەسەردەستی ئەو ڕێی ڕاستیان بۆ ڕوون بوویەوە.

هەروەها دەستی کرد بە نووسین و چەندین کتێبی ناوازە و بەپێزی نووسی، نووسینەکانی ئەو زانایە جگە لە سەردەمی خۆی بۆ سەردەمی دوای خۆی و تا ئەمڕۆش بوونەتە سەرچاوەیەکی بەبایەخ بۆ موسڵمانان.

دواجار ئیمامی (الأشعری) لە ساڵی سێ سەد و بیست و چواری کۆچیدا لە شاری (بغداد) کۆچی دوایی کرد.

**پرسیار:**

٦- باوکی ئیمامی (الأشعری) لە سەرەمەرگیدا چی وت؟
٧- موعتەزیلەکان چییان دەوت؟
٨- خەوەکەی ئیمامی(الأشعری) چی بوو؟
٩- ئیمامی (الأشعری) پاش ئەوەی تەوبەی کرد چی کرد؟
١٠- چ بەشێکی ئەم بەسەرهاتە لەلات خۆش بوو؟

# ابن صلاحی شارەزووری

یەکێک لە زانا گەورە و ناودارەکانی ناو جیهانی ئیسلامی، کەسێکە کە لە نێو خاکی کوردان لە دایکبووە، هەر لەوێ لە خزمەت باوکیدا زانستی وەرگرت و پێگەیشت و دواتریش بە ناوی ناوچەکەی خۆیەوە ناوبانگی دەرکرد، ئەویش (ابن صلاحی شارەزووری).

(ابن صلاح) لە بنەڕەتدا ناوی (عثمانی ابن عبدالرحمان)ە، (عثمان)ی باوکی لە ناوچەی (شارەزوور) نیشتەجێ بوو و یەکێک بوو لە زانا گەورە و ناودارەکانی ناوچەکە، (ابن صلاح) هەر لە گوندی (شەرخان) لە نزیک ناوچەی (شارەزوور) و لە ساڵی ٥٥٧ ی کۆچیدا، لە دایکبوو و هەر لەوێش لای باوکی گەورە بوو.

(ابن صلاح) دوای ئەوەی لە (شارەزوور) لای باوکی زانستێکی زۆری وەرگرت، بڕیاری دا بچێت بۆ ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامی و لەوێش زانست وەربگرێت، بۆیە سەرەتا ڕوویکردە شاری (موصڵ) و لە خزمەت چەندین زانای دیاری

ئەو شارەدا زانستی وەرگرت، هەروەها هەریەک لە شارەکانی (بغداد) و (نەیشابور)، (حلب)، (دمشق) و (حەڕان)یش وانەی خوێند. واتە هەم بەرەو ڕۆژهەڵات و هەم بەرەو ڕۆژئاواش سەفەری کرد، تا زانست وەربگرێت.

هێشتا (ابن صلاح) تەمەنی نەگەیشتبوویە پانزە ساڵان کە یەکێک لە کتێبە زۆر گەورە و بەهێزەکانی ئەو سەردەمەی خوێند بە ناوی (موهەززەب)، ئەوەش جێی سەرسامی زانایان بوو کە توانیبووی لەو تەمەنە کەمەیدا ئەو کتێبە بەهێزە بخوێنێت.

(ابن صلاح)، تا توانی زانستی وەرگرت، لە هەموو بوارەکانی تەفسیر، مێژوو و زمانەوانیدا شارەزاییەکی چاکی پەیدا کرد، بەڵام دواتر گرنگی زۆری دا بە بواری فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و بوو بە زانایەکی دیار و هەڵکەوتەی ئەو بوارە، تا ئەمڕۆش موسڵمانان لە هەموو جیهاندا سوود لە نووسینەکانی وەردەگرن.

(ابن صلاح)، کە چوو بۆ وڵاتی (شام)، پاش وەرگرتنی زانست، دەستی کرد بە بەخشینەوەی ئەو زانستەی کە وەریگرتبوو، بۆیە هەم لە خوێندنگەکاندا وانەی دەوتەوە، هەم لە ماڵی خۆی زانستەکەی دەبەخشی بەوانەی دەهاتنە خزمەتی، هەم بە نووسینی کتێب هەوڵیدا ئەوەی دەیزانێت نەوەک تەنها بۆ خەڵکی سەردەمی خۆی، بەڵکو بیگەیەنێت بە خەڵکی دوای خۆیشی.

دواجار (ابن صلاح) لە بەرەبەریانی ڕۆژی چوارشەممە لە بیست و پێنجی مانگی (ربیع الآخر) ، ساڵی شەش سەد و چل و سێی کۆچیدا، لە (دمشق) وەفاتی کرد، تەمەنیشی شەست و شەش ساڵ بوو، خەڵکێکی زۆر بە هەواڵی مردنی دڵتەنگ بوون و هەمووان ئامادەی ئەسپەردە کردنی بوون.

**پرسیار:**

| |
|---|
| ١- (ابن صلاح) خەڵکی کوێیە؟ |
| ٢- باوکی (ابن صلاح) کێ بوو؟ |
| ٣- بۆچی (ابن صلاح) سەفەری کرد بۆ شارەکانی تر؟ |
| ٤- (ابن صلاح) لە وڵاتی (شام) چی دەکرد؟ |
| ٥- دەتوانیت ژیانی (ابن صلاح) بۆ کەسێکی خۆشەویستت باس بکەیت؟ |

# ابن كثير

ناوی (اسماعیل ابن عمر)ە، لە ساڵی حەوت سەد و یەکی کۆچی لە گوندێکی سەر بە شاری (بوصرا)ی وڵاتی (شام) لە دایکبووە.

باوکی (عمر) یەکێک بوو لە زانا گەورە و ناسراوەکان، بۆیە هەوڵی دەدا منداڵەکانی لەسەر حەز و خۆشەویستی زانست پەروەردە بکات، بەڵام فریای ئەوە نەکەوت (اسماعیل)ی کوڕی پەروەردە بکات، چونکە دوو ساڵ دوای لە دایکبوونی (اسماعیل)ی، باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەوەش ناڕەحەتیەکی زۆر بوو بۆ ئەم منداڵە خۆشەویستە، چونکە هەر لە سەرەتاوە بێبەش بوو لە نازی باوکایەتی.

بەڵام براگەورەکەی (اسماعیل) کە (عبدالوهاب) بوو لەسەردەستی باوکی و زانایانی تر پەروەردە بووبوو، کەوتە پەروەردەکردنی (اسماعیل)ی برای و ڕۆژانە وانەی دەوتەوە بە (اسماعیل) و بە جوانی پەروەردەی دەکرد.

(ابـن كثيـر) لە تەمەنـی حەوت ساڵیدا هـاودەم بە بـرا و کەسوکاری باریان کرد بۆ شاری (دمشق) و لەوێ نیشتەجێ بوون، لەوێ لەسەردەستی برا گەورەکەی وانەی خوێند و زانستی وەرگرت، ئیتر لەوێ خۆی یەکلا کردەوە بۆ زانست و تەنها سەرقاڵی وەرگرتنی زانست بوو، (دمشق)یش شارێک بوو پڕ بوو لە زانـای گەورە و ناسراو، ئەمەش دەرفەتێکی چاک بوو بۆ (اسماعیل)، تا سوود لەو هەموو زانایە وەربگرێت.

(ابن کثیر) دەستی کرد بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و لە تەمەنی یانزە ساڵیدا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد، دواتر فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەبەردەکرد و هەزاران فەرموودەی لە بەرکرد، هەروەها زانستەکانی تریشی وەرگرت، تا بوو بە زانایەکی گەورە.

(ابن کثیر) پاش ئەوەی بوو بە زانایەکی گەورە، دەستی کرد بە وانە وتـنەوە بە خوێنـدکاران و ژمـارەیەکی زۆر قوتـابی پێگەیانـد، هەروەهـا وەڵامـی پرسـیاری خەڵکـی دەدایەوە و کێشەکانی چارەسـەر دەکـرد، کە دەچـوویەوە مـاڵەوە سـەرقاڵی نووسین دەبوو و ئەو زانستەی دەیزانی دەینووسیەوە تا نەوەکانی داهاتووش سوودی لێ وەربگرن. تا ئەمڕۆش کتێبەکانی ئەم زانا گەورەیە لەبەردەسـتی ئـێمەدان و سـوودێکی زۆریـان هەیە بـۆ موسڵمانان.

(ابن کثیر) جێی سەرنج و سەرسامی مامۆستاکانی بوو، ئەوەبوو، یەکێک لە مامۆستاکانی، کە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) فێر دەکرد، سەرسام بوو بە ڕەوشت بەرزی و زیرەکی (ابن کثیر) و دواجار کچێکی خۆی کرد بە هاوسەری، خوای گەورەش چەند منداڵی پێ بەخشین، کە هەموویان لە خزمەت باوکیاندا زانستیان وەرگرت و پەروەردەیەکی جوانیان وەرگرت.

(ابن کثیر) لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تەواو ماندوو بوو، بینایی لە دەستدا، زۆری نەخایاند لە ساڵی ٧٧٤ ی کۆچی و لە ڕۆژی پێنج شەممەدا کۆچی دوایی کرد، پێش مردنی وەسیەتی کردبوو لای (ابن تیمیە)ی مامۆستای ئەسپەردەی بکەن، بۆیە کە وەفاتی کرد وەسیەتەکەیان بەجێگەیاند و لای گۆڕەکەی ئیمامی (ابن تیمیە) ئەسپەردەیان کرد.

**پرسیار:**

| |
|---|
| ١- (ابن کثیر) چەند ساڵ لەگەڵ باوکی ژیا؟<br>٢- بارکردن بۆ (دمشق) چ سوودێکی هەبوو بۆ (ابن کثیر)؟<br>٣- (ابن کثیر) لە تەمەنی چەند ساڵیدا هەموو قورئانی لە بەرکرد؟<br>٤- باسی ژنهێنانەکەی (ابن کثیر) بکە.<br>٥- (ابن کثیر) کە بوو بە زانا چی کرد؟ |

## سعدی کوڕی مسیب

ئەمجار باسی زانا و خواناسێک دەکەین، کە لە شارەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە دایکبووە و ژیا و لە ناو هاوەڵانی پێغەمبەردا (ﷺ) پەروەردەبوو و لەسەردەستی ئەوان زانستی وەرگرت، ئەویش ئیمامی (سعد)ە.

ناوی (سعدی بن مسیب)ە و بە بنەڕەت سەر بە قوڕەیشە، باوکی ئەم پیاوە خواناسە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ).(سعد) لە ساڵی پانزەی کۆچی و لە شاری (مدینە)ی خۆشەویست لە دایکبووە، هێشتا دوو ساڵ بوو ئیمامی (عمر) بوو بوو بە خەلیفەی موسڵمانان.

(سعد) هەر لە (مدینە) گەورە بوو و لەوێ دەستی کرد بە وەرگرتنی زانست، شاری (مدینە) ئەو شارە خۆشەویستەی، کە شوێنی نیشتەجێبوونی پێغەمبەر (ﷺ) بوو و پێغەمبەر (ﷺ) نزای بۆ کردووە. شارێک، کە بە درێژایی مێژوو هەزاران زانای گەورەی پێشکەش بە موسڵمانان کردووە.

لە سەردەمی (سعد)دا موسڵمانان دەسەڵاتیان بەهێز بوو، بەشێکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) مابوون و لە شاری (مدینە) وانەیان دەوتەوە، خەڵکی تەواو تامەزرۆی وەرگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوون، ئەمە دەرفەتێکی باش بوو بۆ (سعد) تا لەو بارودۆخەدا خۆی پێبگەیەنێت.

(سعد) هەر لە (مدینە) هاوسەرگیری کرد و ژنی یەکێک لە هاوەڵە ناسراو و خۆشەویستەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بە هاوسەرگرت، کە ئەویش کچی (ابو هرەیرە) بوو، هەموو جار، کە خەزووری دەبینی دەیوت داوام لە خوایە لە بازاڕی بەهەشتدا بمانگەیەنێتەوە بەیەک.

(سعد) باڵای بەرز بوو، زۆر زوو سەر و ڕیشی سپی کرد، کەسێکی دەوڵەمەند نەبوو، زۆربەی کاتی سەرقاڵی پەرستش بوو، هەرکات دەچوویە دەرەوە هەر کەسی ببینیایە سەلامی لێدەکرد و تەوقەی لەگەڵ دەکرد، پێکەنینی زۆر نەبوو و بەپێی پێویست پێدەکەنی، چونکە کەسانێک هەن هەر لە خۆوە پێدەکەنن و لە کات و شوێنی نەشیاویشدا خۆیان پێ ڕاناگیرێت و هەر پێدەکەنن.

جارێک هەندیک کەس سەرقاڵی پەرستش بوون، کەسێک بە (سعد)ی وت: بۆچی تۆیش ناچیت لەگەڵیاندا پەرستش بکەیت؟

ئەویش وتی: من پەرستشی لەوە گەورەتر دەزانم، ئەویش بیرکردنەوەیە لە دەسەڵاتی خوا و خۆ پاراستن لەوەی خوا حەرامی کردووە و بەجێگەیاندنی ئەو شتانەی خوا فەرمانی پێکردووە.

(سعد بن المسیب) سەرقاڵی ئیشی زەیت بوو، پارە و بەخششی لە خەڵک وەرنەدەگرت و خۆی ڕۆژانە دەچوو بۆ بازاڕ لەوێ ئیشی دەکرد و بەشی بژێوی خۆی و ماڵ و منالی پارەی پەیدا دەکرد.

**پەندو وانە:**

لە م بەسەرهاتەوە ئەوە فێر دەبین وردبوونەوە لە دەسەڵاتی خوا و زانینی گەورەیی خوا بەشێکی گەورەیە لە پەرستش. واتە: وەرگرتنی زانست پەرستشێکە لە هەندیک پەرستشی تر پاداشتی زیاترە، هەروەها ئەوەش فێر دەبین بەجێگەیاندنی فەرزەکان و خۆدوورگرتن لە حەرامەکان زۆر لە پێشترە لە هەندیک کار، کە سوننەتن. بۆ نموونە: نوێژی فەرز لە مزگەوتدا گرنگترە، تا نوێژی سوننەت، بۆیە ئەگەر سەد نوێژی سوننەت بکەین هێندەی نوێژێکی فەرز خێری نییە، ئەمە بەو واتایە نایات وازبهێنین لە سوننەت، بەڵکو دەبێت یەکەمجار گرنگی بدەین بە فەرزەکان ئینجا سوننەتەکان.

(سعد) گرنگیەکی زۆری دەدا بە نوێژە فەرزەکان و ماوەی پەنجا ساڵ هەرچی نوێژی فەرزی هەبوو هەمووی لە مزگەوتدا دەکرد و لە ڕیزی یەکەمیشدا نوێژەکەی دەکرد. واتە: پێش بانگ دەچوو بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی فریای ڕیزی یەکەم بکەوێت.

هەروەها (سعد) زۆر گرنگی دەدا، بە حەجیماڵی خوا، تا ژیا چل جار حەجی ماڵی خوای کرد، ئەوەش فەزڵی خوا بوو، کە دەرفەتی دا بەم زانا خواناسە، تا بتوانێت ئەوەندە جار لە حەجدا بەشداری بکات.

لە ساڵی نەوەد و چواری کۆچیدا (سعد) نەخۆش کەوت، جا وەسییەتی کرد و وتی: ئەگەر مردم لە ناو خەڵکدا جاڕ مەدەن، هەرکەس ئامادە بوو بۆ نوێژکردن لەسەرتەرمەکەم ئەوەندە بەسە.

ئینجا یەکێک لە کەسە خواناسەکان بە ناوی (نافع) هات بۆ لای، (سعد) لە تاو ئازار لە هۆش خۆی چوو. (نافع) وتی: ڕووی بکەنە قیبلە، خێرا (سعد) هاتەوە هۆش خۆی.

ئینجا وتی: کێ پێی وتن وام لێبکەن؟!

(نافع) وتی: من بووم.

ئەویش وتی: ئەگەر ئیمان لە دڵمدا نەبوایە ئەو ڕووکردنە

کەعبەش سوودی نەدەبوو بۆم، بەڵام ئەوە ئیمانی ناو دڵم بوو کە خوا پێی بەخشیوم، سوودی پێگەیاندم.

دواجار (سعد اب المسیب) لە ساڵی نەوەد و چواری کۆچی لە (مدینە) کۆچی دوایی کرد. و لە گۆڕستانی (بقیع) ئەسپەردە کرا، تەمەنیشی نزیکەی هەشتا ساڵ بوو.

**پرسیار:**

| |
|---|
| ١- تایبەتمەندی سەردەمی (سعد) چی بوو؟ |
| ٢- خەزووری (سعد) کێ بو؟ |
| ٣- بۆچی (سعد) نەچوو بۆ لای ئەو کەسانەی پەرستشیان دەکرد؟ |
| ٤- (سعد) چۆن بژێوی خۆی دابین دەکرد؟ |
| ٥- (سعد) لە کاتی وەفاتیدا وەسییەتی چی کرد؟ |

# ئیمامی جەعفری صادق

ئەم ئیمامە خۆشەویستەی ئێستا باسی دەکەین یەکێکە لە زانا ئازیز و خواناسەکانی موسڵمانان، چونکە جگە لەوەی زانایەکی پایەبەرز و خواناس بووە، باپیرە گەورەی خۆشەویستترین کەسی سەر زەویە، ئەویش پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، بۆیە پێویستە زۆر زۆر خۆشمان بوێت.

ئەم زانایە ناوی (جعفر ابن محمد)ە، بەڵام هەر بە (جعفر الصادق) ناسراوە. واتە: (جعفر)ی ڕاستگۆ، (محمد)ی باوکی یەکێک بوو لە زانا گەورەکانی سەردەمی خۆی و بە ئیمامی (باقر) ناسراوە، دایکیشی ناوی (ام فروه)بوو، دایکیشی بە بنەڕەت دەچوویەوە سەر خۆشەویستێکی گەورەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەویش ئیمامی (ابوبکر الصدیق) بوو، ئیتر ئەوە شانازیەکی گەورە بوو بۆ (جعفر) کە ڕەچەڵەکی لە هەردوو

سەرەوە دەچوویەوە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و (ابو بكرالصديق).

(جعفر) لە ساڵی هەشتای کۆچی و لە شارەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) واتا لە شاری (مدينە) لە دایکبووە، هەر لەگەڵ لە دایکبوونیدا لە بنەماڵەیەکی ئایین پەروەر و چاکەخوازدا گەورە بوو، بنەماڵەیەک، کە هەموویان زانا بوون، بۆیە هەر کەس لەو بنەماڵەدا گەورە بووایە دەبوو بە زانایەکی گەورە، هەر لە سەرەتاوە زانستی لە باوکی و باپیریشی وەرگرت، بەڵام زۆر لەگەڵ باوکیدا نەژیا، چونکە لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بوو، کە باوکی کۆچی دوایی کرد.

جگە لەوە ئیمامی (جعفر) ژمارەیەک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینی وەک (انس ابن مالک)، هەروەها چەندین فەرموودەی لە هاوەڵانەوە گێڕایەوە، کە لە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) بیستبوو، دواتریش ئەو فەرموودانەی گێڕایەوە هەم بۆ کورەکەی خۆی و هەم بۆ ژمارەیەکی زۆر لە زانایان، تا ئەمڕۆش ئەو فەرموودانە لە بەردەستی ئێمەدان، یەکێک لە خوێندکارە شارەزا و لێهاتووەکانیشی ئیمامی (أبو حنيفە)بوو، کە لەم کتێبەدا ژیانەکەیمان باس کردووە.

ئیمامی (جعفر) زۆربەی کاتی ژیانی سەرقاڵ بووە بە پەرستشی خوا و وەرگرتنی زانست و وانە وتنەوە، هەرچی کاتی

ژیانی هەیە یان بەڕۆژوو دەبوو یان سەرقاڵی نوێژکردن بوو، یان سەرقاڵی زیکر و پەرستش بوو، یان سەرقاڵی وەرگرتن و بەخشینی زانست بوو.

ئیمامی (جعفر) هەرکات بیویستایە فەرموودەیەک لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بگێڕێتەوە دەبوو دەستنوێژی هەبوایە، ئەگەر دەستنوێژی نەبوایە ئەوە دەچوو دەستنوێژی دەگرت ئینجا فەرموودەکەی دەگێڕایەوە.

جارێک ئیمامی (جعفر) بڕیاریدا سەردانی (بغداد) بکات، سەرکردەی ئەو کاتی موسڵمانان بڕیاریدا بڕێک پرسیاری قورسی بخاتە بەردەم، تا بزانێت چەندە زانستی پێیە، بۆیە ئیمامی (أبو حنیفة)ی ڕاسپارد، تا چل پرسیاری قورسی لێ بکات، ئەویش پرسیارەکانی دانا، کاتێک ئیمامی (جعفر) هات و ئەو پرسیارانەی لێکرا، بە جوانی وەڵامی هەموویانی دایەوە و هەمووان سەرسام بوون بە وەڵامەکانی.

ئیمامی (جعفر) کەسێکی زۆر بەخشندە بوو، جاری وا هەبوو تەنانەت بەشە خواردنەکەی خۆیشی دەبەخشی بە هەژاران و خۆی بە برسێتی دەخەوت، زۆربەی کات لە پێناو بەختەوەری و خۆشحاڵی خەڵکدا هەرچی سەختی و ناڕەحەتی هەبوو دەیخستە ئەستۆی خۆی بۆ ئەوەی خەڵکی لە خۆشیدا بژین.

ڕۆژێک ئیمامی (جعفر) بانگی (موسی)ی کوڕی کرد و ئامۆژگاری کرد و پێی فەرموو: کوڕە شیرینەکەم،

هەرکەس بەو بەشە ڕازی بێت، کە خودا پێی بەخشیوە ئەوە ئیتر پێویستی بە خەڵکی نابێت،

هەرکەسیش چاوی لەوە بێت خەڵک هاوکاری بکات ئەوە، تا دەمرێت تووشی هەژاری دەبێت،

هەرکەسیش کەموکورتی خەڵک ئاشکرا بکات، ئەوە کەموکورتی خۆی ئاشکرا دەبێت،

هەرکەسێ چاڵ بۆ براکەی هەڵکەنێت، ئەوە خۆی دەکەوێتە ئەو چاڵەوە، تا دەتوانیت قورئان بخوێنەرەوە و خەڵک هانبدە چاکە بکەن و ڕێگە مەدە خەڵکی خراپە بکەن، هەر خزمێکت ویستی خزمایەتیت لەگەڵ نەهێڵێت، تۆ هەوڵ بدە لەبەر خوا سەردانی بکە، کوڕی شیرینم هەرگیز قسەی خەڵک بۆ یەک مەگێڕەوە با ڕقیان لە یەکتر نەبێت، سەردانی کەسانی چاک بکە و لە هاوڕێیەتی کەسانی خراپ خۆت دوور بگرە.

دواجار ئیمامی (جعفر) لە ساڵی سەد و چل و هەشتی کۆچی و لە تەمەنی شەست و هەشت ساڵیدا لە شاری (مدینە) کۆچی دوایی کرد، نوێژی لەسەرکرا، ئینجا برا بۆ گۆڕستانی (بقیع)، کە گۆڕی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)،

(فاطمـە)ی دایە گەورەیـی و هەروەهـا گـۆڕی باوکیشـی لەوێ بوو، لە پاڵ گۆڕەکەی باوکیدا ئەسپەردە کرا.

**پرسیار:**

١- باپیرە گەورەی ئیمامی (جعفری) کێیە؟
٢- ئیمامی (جعفر) ڕۆژانە سەرقاڵی چی دەبوو؟
٣- سەردانەکەی ئیمامی (جعفر) بۆ (بغداد) باس بکە.
٤- ئایا دەتوانیت هەندیک لە وەسییەتەکانی ئیمامی (جعفر) باس بکەیت؟
٥- ئیمامی(جعفر) چۆن فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەگێڕایەوە؟

## احمدی گۆرانی

کوردستان بە درێژایی مێژووی ئیسلامی مەڵبەندێکی گەورەی کۆبوونەوەی زانایان بوو، چەندە زانای هەبوو هێندە زیاتریش زانای پێدەگەیاند، بۆیە ئەگەر بڕوانینە کتێبخانەکانی جیهانی ئیسلامی ناو و کتێبی هەزاران زانای ناوداری کوردمان دێنە بەردەست.

یەکێک لەو زانا گەورە و ناسراوانەش کەسێک بوو بە ناوی (ئەحمەد گۆرانی)، ئەو کەسەی، کە هۆکارێکی گەورەی ئازادکردنی شاری (قسطنطنیە)و شکستی مەسیحیەکان بوو.

لە ساڵی هەشت سەد و سیانزەی کۆچی و لە ناوچەی (شارەزوور)دا، منداڵێکی جوان و خۆشەویست لە دایکبووە، ئەم منداڵەشیان ناونا (احمد)، ئەویش لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەری خۆشەویستمان کە یەکێک لە ناوەکانی (احمد)ە.

(احمد) سەرەتای ژیانی لە (شارەزوور) بردە سەر و لەوێ چەندە توانی لە خزمەت زانایان و مامۆستایانی ناوچەکەدا

زانستی وەرگرت، خۆی فێری قورئانی پیرۆز کرد و دواتر فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەبەر دەکرد و زانستەکانی تریشی وەرگرت.

دوای ئەوە (احمد) بڕیاری دا، وەک زانایانی تر لە پێناو زانستدا وڵات و ناوچەی خۆی جێبهێڵێت، ڕقی لە ناوچەکەی خۆی نەبوو، بەڵکو لە پێناو وەرگرتنی زانستدا، چونکە زانست هێندە پیرۆزە، کە مرۆڤی ژیر ئامادەیە هەموو جیهان بگەڕێت، تا بەدەستی بهێنێت.

ئەمجارەیان (احمد) ڕوویکردە شاری (بغداد)، ئەو شارە گەورەی کە مەڵبەندی سەدان زانای گەورە بوو، لەوێ هەموو قورئانی پیرۆزی لە بەرکرد و لە خزمەت زانایانی ئەوێدا زانستێکی زۆری وەرگرت.

پاش ئەوەش (احمد) بڕیاری دا، ڕووبکاتە وڵاتی (شام) و سوود لە زانایانی ئەوێش وەربگرێت، لەوێش چەندین شار گەڕا، چوو بۆ شاری (دیاربکر) و دواتریش چوو بۆ (دمشق)، لەوێشەوە ڕوویکردە وڵاتی (مصر).

(احمد)ی گۆرانی کەسێکی زۆر هەژار بوو، چونکە بڕیاری دابوو خۆی سەرقاڵ نەکات بە ئیش و کاری ترەوە و هەموو کاتی خۆی بدات بە وەرگرتنی زانست، داوای هیچیشی لە خەڵک نەدەکرد، بۆیە لەو گەشت و سەفەرانەی کە دەچوو تا

زانست وەربگرێت، سەختی و هەژاری و برسێتی زۆری تووش دەبوو.

(احمد) دوای ئەوەی زانستێکی زۆری وەرگرت، ئینجا ڕوویکردە ولاتی (ترکیا) و لەوێ مایەوە، ئەوە دەرفەتێکی چاک بوو تا سەرکردەی ئەوکاتی موسڵمانان سوود لە زانستی ئەو زانایە وەربگرێت، بۆیە سوڵتان (مرادی دووەم) ڕۆژێک مامۆستا (احمد)ی بانگ کرد و تکای لێکرد (محمد)ی کوڕی بگرێتە خۆ و جوان پەروەردەی بکات و زانستی فێربکات، ئیتر لەو کاتەوە مامۆستا (احمد) بوو بە مامۆستای (محمدی فاتح).

مامۆستا (احمد) زۆر بە جوانی کەوتە پەروەردەکردنی (محمد) و سەرەتا قورئانی پیرۆزی فێرکرد، ئینجا زانستی تری پێ بەخشی، ترسی ئەوەشی نەبوو کە ئەوە کوڕی سوڵتانە، بەڵکو لەسەرهەر هەڵە و تەمبەڵیەک سزای دەدا.

مامۆستا (احمد) هەر لە سەرەتاوە چاوی لەوە بوو (محمد) وا پەروەردە بکات ببێتە سەرکردەیەکی دڵسۆزی ئیسلام، بۆیە زۆر باسی جیهادی بۆ دەکرد، هەروەها باسی ئەو فەرموودەی بۆ دەکرد، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:(بە دڵنیاییەوە قوستەنتینییە ئازاد دەکردیت، سەرکردەی ئەو سوپایە زۆر چاکە و سوپاکەش زۆر چاکە)، بۆیە دەیوت (محمد) گیان دەبێت تۆ هەوڵ بدەیت ببیت بەو کەسە، هێندە گرنگی دا بە

(محمـد) و پەروەردەی کـرد، تـا تـوانی (محمـد) بکـات بە سـەرکردەیەکی وا بتوانێـت سـوپای دوژمـن بشـکێنێت و شاری (قسطنطنیە)ئازاد بکات، ئیتر ئەو شارە بوو بە پایتەختی موسڵمانان و لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئەو شارە هی موسڵمانانە، ئەمڕۆش (قسطنطنیە) ناسراوە بە (استانبول) و دەکەوێتە خاکی (ترکیا)وە.

مامۆستا (احمد) جگە لەوەی خوێندکار و قوتابیەکی زۆری هەبوو و زانستی پێ دەبەخشین، هاوکات سەرقاڵی نووسین دەبوو و چەندین کتێب و نووسینی پێشکەشی موسڵمانان کرد.

دواجار مامۆستا (احمد) لە ساڵی هەشت سەد و نەوەد و سێی کۆچی و لە شاری (قسطنطنیە)دا وەفاتی کرد و سوڵتانی موسڵمانان نوێژی لەسەرکرد و لەوێ تەرمەکەی ئەسپەردە کرا.

**پرسیار:**

١- مامۆستا (احمد) خەڵکی کوێ بوو؟
٢- بۆچی (احمد) گەشتی کرد بۆ شار و وڵاتانی تر؟
٣- بۆچی مامۆستا(احمد) هەژار بوو؟
٤- پەیوەندی مامۆستا (احمد) و سوڵتانی موسڵمانان چی بوو؟
٥- مامۆستا (احمد) چۆن (محمد)ی پێگەیاند؟

## ناوەرۆك



لەم نووسینەدا هەوڵمان داوە، ژیانی (سێ) زانا و سەرکردە بهێنین لەسەر بنەمای جیاوازی رەگەزیی و ناوچەییان، بەڵام یەکدەنگی هەموویان لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننەتن، تا نەوەکانمان بزانن هەموو ئوممەتانی موسڵمان زانایانی رێ ڕاستیان تێدا بووە، کە خزمەتی گەورەیان پێشکەشکردووە.

بۆ نموونە: باسی(إبن مندە)مان هێناوە، کە فارسە، (عمر بن عبدالعزیز)مان هێناوە، کە عەرەبە، (ابن تیمیة) و (صلاح الدین)مان هێناون، کە کوردن، (محمد الفاتح)مان هێناوە، کە تورکە، (یوسف)ی کوڕی (تاشفین)مان هێناوە، کە بەربەریە(صنهاجی)، ئەمەش وێنەی جوانی ئەو برایەتییە ئیمانییەیە، کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکردووە.


نرخی 4.000 دینار



9 789922 654713

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی



/TafseerOffice

+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com